# باخچەی ڕەوشتەکان

## ڕوونکردنەوەی
## الأربعون الصغرى للإمام البيهقي

المخرجة في أحوال عباد الله تعالى واخلاقهم
للحافظ أبي بكر أحمد بن الحسين البيهقي
(ت ٤٥٨هـ)

ئەردەوان مستەفا مزوری

## کورتەیەك دەربارەی پێشەوا

## ( البیهقي)

- ناوی ئەحمەدە کوڕی حوسەینی کوڕی عەلی، پاڵدەدرێ بۆ ( بیهق) کە شارێکە لە نەیسابور، نەیسابوریش شارێکی گەورەی خوراسانە.
- ساڵی ( ٣٨٤) کۆچی لە دایك بووە و بۆ داواکردنی زانست گەشتی کردووە بۆ بەغداو، مەککەی پیرۆزو، کوفە ، لە ساڵی ( ٤٥٨) کۆچی وەفاتی کردووە.
- زانایان زۆر ستایشی پێشەوا ( البیهقي) یان کردووە.
- پێشەوا ( الذهبي ) دەڵێ: " پێشەوایە، حافیظە، بلیمەتە، شێخی خوراسانە، خاوەنی دانراوەکانە".
- ( إمام الحرمین أبو المعالي) دەڵێ: " هەر شافعیەك هەبێ مەگەر شافعی منەتی بەسەرەوە هەیە تەنها ئەبوبەکری بەیهەقی نەبێ، ئەو منەتی بەسەر شافعیدا هەیە، لەبەر ئەو هەموو کتێبانەی داینـاوە بۆ سەرخستنی ڕێبازەکەی".
- شایانی باسە پێشەوا ( البیهقي) چەندەها پەرتووکی داناوە، کە بەڵگەن لەسەر زۆری زانستەکەی ، لەوانەش:
- السنن الکبری، الأسماء والصفات، أحکام القرآن، مناقب الشافعي،دلائل النبوة، بیان خطأ من أخطأ علی الشافعي.

# باخچەی ڕەوشتەکان

ڕونکردنەوەی

( الأربعون الصغرى )

المخرّجة في أحوال عباد الله تعالى وأخلاقهم

للحافظ أبي بكر أحمد بن الحسين البيهقي ( ت ٤٥٨ هـ )

ن/ ئەردەوان مستەفا مزوری

ماستەر لە خوێندنی ئیسلامی

باخچەی ڕەوشتەکان، ڕونکردنەوەی (الأربعون الصغرى للإمام البيهقي)

نووسەر: ئەردەوان مصطفى مزوری

دیزاین و بەرگ: نووسینگەی A4

تیراژ: ١٠٠٠

چاپ: یەکەم

٢٠٠٩ زاینی – ١٤٣٠ کۆچی

چاپخانەی ڕۆژهەلات – هەولێر

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٢٥٧٦) ساڵی ٢٠٠٩ ی پێی دراوە

## پێشەکی

بەناوی خودای مەزن و زانا، ئەو خودایەی پێغەمبەرەکەی ڕازاندەوە بە ڕەوشتی بەرز و جوان، سەلات و سەلام لەسەر پێغەمبەرمان موحەممەد – دروودی خودای لەسەر بێت – کە لوتکەی ڕەوشت بەرزی و، نمونەی ڕەفتاری جوان بو، هەروا بۆ سەر یاوەران و شوێنکەوتوانی تا دوا ڕۆژ.

**پاشان**: بێگومان فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ بەدووەمین سەرچاوەی شەریعەتی ئیسلام لەقەلەم دەدرێ، دوای قورئانی پیرۆز، بۆیە قورئانی پیرۆز فەرمانمان پێدەکات کە هەر فەرمانێکمان پێکرا لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ وەریبگرین و، هەر شتێکیشی لێ قەدەغەکردین وازی لێ بهێنین. زانایان زۆر خزمەتی فەرمودەی پێغەمبەریان کردووە لە هەموو ڕوویێکەوە، لە کۆکردنەوەی فەرمودەکان و ڕاڤەکردنیان و جیاکردنەوەی فەرمودەی ڕاست لە فەرمودەی ناراست و لاواز ... خودا پاداشتیان بداتەوە. یەکێ لەو لایەنانەی کە زانایان بایەخیان پێداوە کۆکردنەوەی چل فەرموودەیە لە پەرتوکێکدا، هەر یەکەیان بە شێوازێك.

ئەم پەرتووکەی زاناو پێشەوا ( البيهقي) یەکێکە لەو پەرتوکە نرخدارو گرانبەهایانەی کە لەم بوارەدا نوسراوە، کە خۆی لە چل باسدا دەبینێ و، لە ژێر هەر باسێکدا چەندەها فەرمودە دێنێتەوە. نرخی ئەم پەرتووکە لەوەدایە کە زیاتر ئەو فەرمودانەی تێدا تۆمارکراوە کە هانی موسڵمان دەدەن خۆی بڕازێنێتەوە بە ڕەوشتی بەرزو، خۆی دووربگرێ لە ڕەوشتی خراپ .

بێگومان ڕەوشتی بەرز هۆی سەرکەوتنی گەل و نەتەوەکان و مانەوەیانە، بەپێچەوانەوە بڵاوبونەوەی ڕەوشتی خراپ و، ڕەفتاری بەد ئامرازی داڕزینی گەل و نەتەوەکان و لەناوچوونیانە. لەم ڕوانگەیەوە ، بە گەرەکمان زانی ئەم پەرتوکە نایابەی زانا و پێشەوا ( البيهقي) ڕاڤە بکەینە سەر زمانی شیرینی کوردی و، بیخەینە بەردەم خوێنەری بەڕێزەوە و، هەنگاوێك بێت بۆ خۆجوانکردنمان بە ڕەوشتی بەرزو، فڕەدانی ڕەوشتی خراپ.

ئێمە لە ڕاڤەکردنەکەماندا پشتمان بە سەرچاوە ڕەسەنەکانی فەرموودە بەستووەو، سەرەتا واتای فەرمودە ڕون دەکەینەوە، ئنجا هەندێ لە سودەکانی فەرمودە باس دەکەین.

**لە کۆتاییدا**: داواکارین لە خودای مەزن ئەم کارەمان لێ قبولێ بکا و، یارمەتیمان بدا بۆ پتر کاری چاکەو، موسڵمانان سەرکەوتوو بکات و لە گوناه و کەمتەرخەمییەکانمان خۆش ببێت.

ئەردەوان مستەفا مزوری

٢٧– ٩ – ١٤٣٠ کۆچی – ڕەمەزانی پیرۆز

# مقدمة

بسم الله الرحمن الرحيم ، الحمد لله كفاء حقه ، والصلاة على خير خلقه ، محمد النبي المصطفى ، والرسول المجتبى وعلى آله ، كلما ذكره الذاكرون ، أو غفل عن ذكره الغافلون ، والحمد لله الذي أقام الحجة على وحدانيته ، ثم على صدق نبينا محمد ﷺ في دعوى رسالته ، وتركه في أمته ، حتى دعا عباده إلى عبادته ، وهدى من شاء منهم لإجابته ، وبين على لسانه ما يحتاج إلى معرفته ، للقيام بشريعته ، وحث رسول الله ﷺ أصحابه على حفظ سننه ، ثم على أدائها إلى من يأتي بعده من أمته ، ليكونوا على علم فيما يلزمهم من استعمال طاعته ، واجتناب معصيته ، وكان يقول في آخر خطبته : " اللهم هل بلغت ؟ " فيقولون : نعم ، فيقول : " ألا ليبلغ الشاهد الغائب ، فلعل بعض من يُبلَّغُه أن يكون أوعى له من بعض من سمعه " ، وربّما كان يقول : " فرُبَّ مبلَّغٍ أوعى من سامع " [١].

وكان يقول ما أخبرنا الأستاذ أبو بكر محمد بن الحسن بن فورك ، أنا عبد الله بن جعفر الأصبهاني ، ثنا يونس بن حبيب ، ثنا أبو داود الطيالسي ، ثنا شعبة ، عن عمر بن سليمان ، عن عبد الرحمن بن أبان ، عن أبيه قال : سمعت زيد بن ثابت ﷺ يقول : سمعت رسول الله ﷺ يقول : " **نضَّر الله امرأ، سمع منا حديثا فحفظه حتى يبلغه غيرَه ، فرُبَّ حامل فقه إلى من هو**

---

١ – بەناوی خودای بەخشندەو میهرەبان، هەموو سوپاسێك بۆ خودا هاوتای مافەكەی، سەلەوات لەسەر باشترین بەدیهێنراوی، موحەممەدی پێغەمبەری هەڵبژێردراو و، پەیامبەری پەسندكراوو لەسەر خزم و كەسانی، هەرچەندەی زیكركەرەكان یادیان كردەوە، یان بێ ئاگایان لە یادكردنی بێ ئاگابون، سوپاس بۆ ئەو خودایەی، كە بەڵگەی هێناوەتەوە لەسەر یەكتاپەرستیەكەی خۆی، ئنجا لەسەر ڕاستگۆیی پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ لە بانگەشەكردنی پەیامەكەیداو، پێغەمبەری هێشتەوە لەناو ئوممەتەكەیدا، تاوەكو بەندەكانی بانگ كرد بۆ پەرستنی خوداو، خوداش ئەو كەسەی حەزی كرد لەوان هیدایەت دا بۆ وەڵام دانەوەی بانگەوازی موحەممەد ﷺ، لەسەر زبانی موحەممەد ﷺ ئەوەی ڕونكردەوە كە بەندە پێویستی بە زانینی هەیە، بۆ ئەنجامدانی شەریعەتی خوداو، پێغەمبەری خوا ﷺ هانی یاوەرانی دا بۆ پاراستنی سوننەتەكەی، ئنجا بۆ گەیاندنی بەو كەسانەی كە دوای ئەو دێن لە ئوممەتەكەی، بۆ ئەوەی بزانن چ لەسەریان پێویستە لە كردنی پەرستشەكانی خوداو، وازهێنان لە گوناهكردن بەرامبەر بەخوداو، لە دوا وتاریدا دەیفەرموو: " ئەی خودایە! ئایا ئەم ئایینەم پێ ڕاگەیاندن؟"، یاوەرەكانیش دەیان وت: بەڵێ، ئەویش دەیفەرموو:" ئاگادار بن! ئەوەی ئامادەیە لێرە با بەو كەسە ڕابگەیەنێت كە لێرە نییە، لەوانەیە هەندێ لەو كەسانەی پێیان ڕادەگات هۆشیارترو پارێزەرتر بن بۆ ئەم فەرمودانە لە هەندێ لەو كەسانەی كە بیستویەتی – یەكەم جار –"، ڕەنگە فەرموبایی :" زۆرجار كەسێكی پێ ڕاگەیەندراو تێگەیشتوترو پارێزەرترە – بۆ فەرموودە – لەو كەسەی یەكەم جار بیستویەتی ".

أفقه منه ، ورب حامل فقه ليس بفقيه ، ثلاثٌ لا يُغَلُّ عليهن قلبُ مسلم : إخلاص العمل لله ، ومناصحة ولاة الأمر ، ولزوم الجماعة ، فإن دعوتهم تحيط من ورائهم ". خرجه أبو داود السجستاني في كتابه السنن مختصرا ، ورواه أيضا عبد الرحمن بن عبد الله بن مسعود ، عن أبيه ، عن النبي ﷺ ، ورغب رسول الله ﷺ أمته في طلب العلم ، وأخبرنا بما فيه من الفضل ، فقال فيما أخبرنا الحاكم أبو عبدالله، محمد بن عبدالله الحافظ، ثنا أبوالعباس، محمد بن يعقوب، ثنا الحسن بن علي بن عفان العامري، ثنا عبدالله بن نمير، عن الأعمش، عن أبي صالح، عن أبي هريرة، ﷺ ، قال: قال رسول الله ﷺ:" **مَنْ سَلَكَ طَرِيقًا يبتغي به علْمًا سَهَّلَ الله له به طَرِيقًا إلى الْجَنَّة، وما جلس قَوْمٌ في مسجد من مساجد اللّه تعالى، يَتْلُونَ كتَابَ اللّه وَيَتَدَارَسُونَهُ بَيْنَهُمْ إلا حَفَّتْهُمْ الْمَلَائكَةُ، ونَزَلَتْ عليهم السَّكِينَةُ، وَغَشِيَتْهُمْ الرَّحْمَةُ وَذَكَرَهُمْ الله فِيمَنْ عِنْدَهُ وَمَنْ أَبَطأَ بِهِ عَمَلُهُ لم يُسْرِعْ بِهِ نَسَبُهُ**". رواه مسلم في الصحيح عن محمد بن عبدالله بن نمير، عن أبيه[٢].

وأخبرنا أبو عبد الله الحافظ ، وأبو بكر أحمد بن الحسن القاضي ، وأبو صادق محمد بن أحمد بن أبي الفوارس العطار قالوا : ثنا أبو العباس محمد بن يعقوب ثنا إبراهيم بن مرزوق ، ثنا عبد الله بن داود الخريبي ، عن عاصم بن رجاء بن حيوة ، عن داود بن جميل ، عن كثير بن قيس قال : كنت جالسا مع أبي الدرداء في مسجد دمشق، فأتاه رجل فقال : يا أبا الدرداء جئتك من المدينة مدينة الرسول ﷺ لحديث بلغني أنك تحدثه عن رسول الله ﷺ قال : ولا جئت لحاجة ؟ قال : لا قال : ولا لتجارة ؟ قال : لا قال : ولا جئت إلا لهذا الحديث ؟ قال : نعم قال : فإني سمعت رسول الله ﷺ يقول : " من سلك طريقا يطلب فيه علما سلك الله به طريقا من طرق الجنة

---

٢ – زەیدی کوڕی سابت ﷺدەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خودا بوﷺ دەیفەرمو:" خودا نیعمەتی خۆی لەگەڵ ئەو کەسە بکات کە فەرمودەیەکی لە ئێمە بیستووەو لەبەریکردووە تاوەکو بە یەکێکی تری رادەگەیەنێ، زۆرجار هەڵگری زانست – لەوانەیە شەرع زان بێ – بەڵام دەیگوازێتەوە بۆ شەرع زانێکی شەرع زانتر لەو، زۆرجار هەڵگری زانستێك شەرع زان نیە – بەڵام خێری گواستنەوەی زانستەکەی دەگاتێ–، سێ ڕەوشت هەن کە موسڵمان خیانەتیان تێدا ناکات: کردنی کردەوە بەدڵسۆزی بۆ خوداو، ئامۆژگاریکردنی کاربەدەستان و، هاوڕایی موسڵمانان لە بیروباوەڕو کردەوەی باشدا، چونکە پاڕانەوەکانی موسڵمانان دەوروەی ئەوانی داوە – لە فێڵی شەیتان دەیانپارێزێ – " . پێغەمبەری خودا ﷺهانی ئوممەتەکەی داوە بۆ داواکردنی زانست و، بە ئێمەی ڕاگەیاندووە کە داواکردنی زانست چ خێرێکی تێدایەو، فەرمویەتی:" هەر کەسێك ڕێگایەك بگرێتەبەر کە داوای زانستێکی تێدا بکا خودا ڕێگای بەهەشتی بۆ ئاسان دەکا، هەر کۆمەڵەیەکیش لە مزگەوتێك لە مزگەوتەکانی خودا دابنیشن و قورئان بخوێننەوەو دیراسەتی بکەن مەگەر فریشتەکان دەورەیان دەدەن و، هێمنیان دادەبەزێتە سەرو، ڕەحمەت دایان دەپۆشێ و، خودا لەلای خۆی باسیان دەکاو، هەر کەسێك بەکردەوەکانی دواکەوتبێ، نەژادەکەی فریای ناکەوێ".

، وإن الملائكة لَتَضعُ أجنحَتها رضا لطالب العلم ، وإن العالمَ لَيستغفرُ له من في السـماوات ومـن في الأرض ، وكلُّ شيءٍ حتى الحِيتانُ في جوف الماء ، وإن فضلَ العالم على العابد كفضل القمـر ليلـة البدر على سائر الكواكب ، إن العلمـاء ورثـة الأنبيـاء ، إن الأنبيـاء لم يورِّثـوا درهمـا ولا دينـارا ، وإنما ورَّثوا العلمَ ، فمن أخذهُ أخذ بِحَظٍ وافرٍ ". هذا حديث أخرجه أبو داود السجستاني في كتابـه عن مسدد عن الخريبي ورواه من جهة أخرى عن عثمان بن أبي سودة عن أبي الدرداء بمعناه[٣].

والأحاديث التي رويت في فضل العلم وطلبه ، وحفظ السنة وأدائها كثيرة ، وهي في مصنفاتي المبسوطة مذكورة . ومما يدخل في معناه ما روي بأسانيد واهية ، عن النبي ﷺ أنه قال : " من حفظ على أمتي أربعين حديثا ، ينتفعون بها، بعثه الله يوم القيامة فقيها عالما"، وقد خرّجت من الأحاديث التي يفتقر إليها أصحاب الحديث في معرفة ما يجب اعتقاده بالقلب ، واستعماله باللسان والأركان ، وصار شعارا لهم حيث كانوا في البلدان ما تيسر إخراجه في أربعين بابا ، وأنا أستخير الله في إخراج بعض ما يحتاجون إلى معرفته للاستعمال في أحوالهم وأخلاقهم في أربعين بابا " ليكون بُلغة لهم فيما لا بُدّ لهم من معرفته في عبادة الله تعالى ، مع ما سبق ذكره في الأربعين التي خرجتها في بيان معالم دين الله تعالى ، وأستعين بالله العزيز الكريم على استعمال ما علمني ، وأسأله الزيادة في العُلا ، والعفو عني فيما قصرت فيه من مواجبه ، وأبرأ إليه من حولي وقوتي ، ولا حول ولا قوة إلا بالله العلي العظيم [٤].

---

٣ – كەسیری كوڕی قەیس دەڵێ: من لەگەڵ ( أبو الدرداء) دانیشتبوم لە مزگەوتی دیمەشقدا، پیاوێك هاتە لای و وتی: ئەی ( أبو الدرداء) من لە شاری پێغەمبەرەوە ﷺ هاتومەتە لات لەبەر فەرمودەیەك كە پێم گەیشتوە تۆ دەیگێڕیەوە لە پێغەمبەری خوداوەﷺ ، ( أبو الدرداء) وتی: بۆ هیچ پێویستیەك نەهاتوی؟ پیاوەكە وتی: نەخێر، ( أبو الدرداء) وتی: بۆ بازرگانیش نەهاتوی؟ پیاوەكە وتی: نەخێر، ( أبو الدرداء) وتی: تەنها لەبەر ئەم فەرمودەیە هاتوی؟ پیاوەكە وتی: بەڵێ، ( أبو الدرداء) وتی: من گوێم لە پێغەمبەری خودا بوە ﷺ دەیفەرمو:" هەر كەسێك ڕێگایەك بگرێتەبەر بۆ داواكردنی زانستێك خودا ڕێگایەك لە ڕێگاكانی بەهەشتی بۆ ئاسان دەكا، فریشتەكان باڵەكانیان دادەنێن بۆ داواكاری زانست، ئەوەی لە ناو ئاسمانەكاندایەو ئەوەی لەناو زەویدایەو، هەمو شتێك تەنانەت ماسی لەناو ئاودا داوای لێخۆشبوون بۆ زانا دەكەن، گەورەیی زانا بەسەر خودا پەرستەوە وەكو گەورەیی مانگی چواردە شەوە لەسەر گشت ئەستێرەكاندا، زانایان میراتگری پێغەمبەرانن، پێغەمبەرەكان دینار و دیرهەمیان بەمیرات جێ نەهێشتووە، بەڵكو زانستیان وەكو میرات بەجێ هێشتوە، هەر كەسێك وەریگرت ئەوە بەشێكی زۆری وەرگرتوە".

٤ – ئەو فەرمودانەی دەربارەی گەورەیی زانست و داواكردنی گێردراونەتەوەو، لەبەركردنی سوننەت و گەیاندنی زۆرن و، ئەو فەرمودانە لە پەرتوكە درێژەكانمدا باسكراون، ئەوەی دەچێتە ژێر ئەم مانایەوەش ئەو فەرمودەیەیە كە بەچەند ئیسنادێكی لاوازەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ

## الباب الأول: في توحيد الله في عبادته ( دون ما سواه )

## بابەتی یەکەم: یەکتاپەرستی خودا لە پەرستنیدا

– أخبرنا أبو عبد الله، محمد بن عبدالله الحافظ، ثنا أبو عبد الله محمد بن يعقوب الشيباني، الحافظ، إملاءً، ثنا إبراهيم بن عبد الله السعدي، ثنا يزيد بن هارون، ثنا أبو مالك الأشجعي، عن أبيه، قال: سمعت النبي ﷺ يقول :" **من وحّد اللهَ، وكفر بما يُعبد من دون الله، حرُم ماله ودمه، وحسابه على الله** ". رواه مسلم، عن زهير بن حرب، عن يزيد بن هارون.

**واتای فەرموودە:**

هەر کەسێك خودا بەتەنیا بپەرستێ و، باوەڕ نەکا بەوانەی دەپەرسترێن جگە لە خودا، ئەوە ماڵ و خوێنی ئەو کەسە حەرام دەبن – واتە نابێ دەستدرێژیان بکرێتە سەر –، حسابەکەشی لەسەر خودایە لەو شتانەی بە پەنهانی ئەنجامی دەدات و ئێمە پێی نازانین.

**لە سوودەکانی فەرموودە:**

١– حوکمەکان بەگوێرەی دیار بەڕێوەدەچن و، حوکمی کارە پەنهانەکانیش لای خودایە.

– أخبرنا أبو طاهر، محمد بن محمد بن محمش الفقيه، أنا أبو حامد بن بلال البزار، ثنا أحمد بن منصور المروزي، ثنا النضر بن شميل، أنا شعبة، عن أبي إسحاق، قال: سمعت عمرو بن ميمون، عن معاذ بن جبل، قال: قال رسول الله ﷺ : " **ما حق الله تعالى علي العباد**" قال: الله ورسوله أعلم ، قال:" أن يعبدوه ولا يشركوا به شيئا. قال:" **فما حقهم على الله إذا فعلوا ذلك**". قال: الله ورسوله أعلم، قال:" **يغفر لهم ولا يعذبهم**".

---

گێردراوەتەوە کە فەرمویەتی:" هەر کەسێك چل فەرموودە بۆ ئوممەتەکەم بپارێزێ، کە ئوممەت سوودیان لێ وەربگرێت، لە دوا ڕۆژدا خودا ئەو کەسە زیندوو دەکاتەوە وەکو کەسێکی شەرع زان و زانا". من ئەو فەرمودانەم گواستوتەوە کە خاوەنانی فەرموودە پێویستیان پێی هەیە لە زانینی ئەو شتانەی کە پێویستە دڵ باوەڕی پێیان هەبێت و، بەکارهێنانیان بە زبان و ئەندامەکان و، بووتە دروشمیان کاتێ لە شارەکان بون لە چل باسدا. من ئیستیخارەی خودا دەکەم لە گواستنەوەی هەندێ لەو فەرمودانەی کە پێویستیان پێی هەیە لە بارودۆخەکانیان و ڕەوشتەکانیاندا لە چل باسدا، بۆ ئەوەی بیانگەیەنێتە ئەوەی کە پێویستە بیزانن لە پەرستشی خودای پایەبەرزدا، لەگەڵ ئەوەی باسکردنی رابرا لەو چل باسانەی کە گواستومەتەوە لە ڕونکردنەوەی دروشمەکانی ئایینی خودای مەزن، داوای یارمەتی لە خودای دەسەلأتدارو بەخشندە دەکەم بۆ بەکارهێنانی ئەوەی فێری کردووم و، داوای زیاتری لێدەکەم لە بەرزی و شکۆداریداو، داوای لێبووردنی لێدەکەم لەوەی کەمتەرخەم بومە تیایدا لە واجباتەکانی، خۆم پاکانە دەکەم لە هێز و توانام و، هیچ هێزو توانایەکم نیە تەنها بەخودای بەرزی گەورە نەبێت.

أخبرنا أبو عبد الله الحافظ، ثنا أبو عبد الله محمد بن يعقوب، ثنا حسين بن محمد بن زياد، ثنا أبو بكر بن أبي شيبة، ثنا أبو الأحوص، عن أبي إسحاق، فذكره بإسناده ومعناه.

رواه البخاري، عن إسحاق بن إبراهيم الحنظلي، عن يحيى بن آدم، عن أبي الأحوص، ورواه مسلم، عن أبي بكر بن أبي شيبة.

**واتای فەرمودە:**

پێغەمبەری خوا ﷺ بە موعازی کوڕی جەبەلی ﷺ فەرمو: ئایا مافی خودای گەورە بەسەر بەندەکانیەوە چییە؟ وتیان: خودا و پێغەمبەرەکەی زاناترن، فەرموی: ئەوەیە بەندەکان خودا بپەرستن و – بەکردنی پەرستشەکان و وازهێنان لە گوناهەکان – هاوبەشی بۆ دانەنێن. ئنجا پێغەمبەرﷺ فەرموی: ئایا مافی بەندەکان لەسەر خودا چییە، ئەگەر ئەوان وایان کرد؟ وتی: خوداو پێغەمبەرەکەی زاناترن. فەرموی: لێیان خۆش ببێ و سزایان نەدات.

**لە سودەکانی فەرمودە:**

١- ڕێزو گەورەیی موعازی کوڕی جەبەل ﷺ لەلای پێغەمبەر ﷺ.

٢- خۆبەکەم زانینی پێغەمبەر ﷺ.

٣- دووبارەکردنەوەی قسە بۆ تێگەیشتاندن.

## الباب الثاني : في التوبة من جميع ما كره الله تعالى

## بابەتی دووەم: تۆبەکردن لە گشت ئەو قسەو کردارانەی خودای پایەبەرز پێی ناخۆشن

– أخبرنا الأستاذ أبو بكر محمد بن الحسن بن فورك، أنا عبد الله بن جعفر، ثنا يونس بن حبيب، ثنا أبو داود، ثنا شعبة، أخبرني عمرو، وهو ابن مرة، سمع أبا بردة، يحدث أنه سمع رجلا من جهينة، يقال له: الأغر، يحدث ابن عمر، أنه سمع النبي ﷺ يقول: **" يا أيها الناس! توبوا إلى ربكم، فإني أتوب إليه في اليوم مائة مرة "**. رواه مسلم، عن محمد بن المثنى، عن أبي داود الطيالسي.

**واتای فەرموودە:**

ئەی خەڵکینە! تۆبە بکەن و بگەڕێنەوە لای خودای خۆتان ، من لە ڕۆژدا سەد جار تۆبە دەکەم و دەگەڕێمەوە لای خودا.

**لە سودەکانی فەرمودە:**

١- هۆی داوا کردنی لێخووشبون لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ – هەر چەندە خودا لە گوناهەکانی پێش و پاشی خۆشببو – بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە ئێمەی موسڵمان فێر بکات، هەمیشە تۆبە بکەین، پێغەمبەرمان ڕۆژێ سەد جار تۆبەی دەکرد– هەرچەندە گوناهی نەبو – ،

ئەی ئێمەی گوناهبار، دەبێ ڕۆژێ چەند جار تۆبە بکەین!!

٢- ئێمە زیاتر پێویستیمان بە تۆبەکردن و گەڕانەوەیە بۆ لای خودا، چونکە ڕۆژانە ڕووبەرووی چەندەها گوناه دەبینەوە.

٣- پێشەوا ( النووي ) دەڵێ :" تۆبە لە گرنگترین ڕێساکانی ئیسلامەو، یەکەم پایەی ئەو کەسانەیە کە ڕێگەی دوا ڕۆژ دەگرنەبەر"، صحيح مسلم بشرح النووي، ١٧/ ٢٥.

- حدثنا السيد أبو الحسن، محمد بن الحسين بن داود العلوي، أنا القاسم عبد الله بن إبراهيم بن بالوية المزكي، أخبرنا أبو طاهر الفقيه، وأبو يعلي حمزة بن عبد العزيز الصيدلاني، قالا: ثنا أبو بكر محمد بن الحسين القطان، قالا: ثنا أحمد بن يوسف السلمي، ثنا عبد الرزاق، ثنا معمر، عن همام ابن منبه، قال: هذا ما حدثنا به أبو هريرة ، قال : قال رسول الله ﷺ :" **أيفرح أحدكم براحلته، إذا ضلّت منه ثم وجدها ؟ قالوا: نعم يا رسول الله! قال : والذي نفس محمد بيده، لله أشد فرحا بتوبة عبده إذا تاب، من أحدكم براحلته إذا وجدها** ". رواه مسلم، عن محمد بن رافع، عن عبد الرزاق، وأخرجه البخاري ومسلم من حديث عبد الله بن مسعود، وأنس بن مالك عن النبي ﷺ ، وأخرجه مسلم من حديث النعمان بن بشير والبراء ابن عازب عن النبي ﷺ .

قال الشيخ: قوله ( لله أفرح ) معناه: لله أرضى بالتوبة وأقبل لها، والفرح قد يكون بمعنى الرضى، قال الله تعالى { كل حزب بما لديهم فرحون }، أي: راضون به.

**واتای فەرموودە:**

ئایا یەکێکتان کەیف خۆش دەبێت ئەگەر ولاغەکەی لێی ون بو، ئنجا دۆزیەوە؟ وتیان: بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خودا! فەرموی: سوێند بە خودا کە گیانی موحەممەدی بەدەستە، خودا زیاتر کەیف خۆشە بە تۆبەی بەندەکەی کاتێ تۆبەدەکات، لە یەکێکتان کە ولاغەکەی لێی ون بوە، ئنجا دۆزیویەتەوە.

**لە سودەکانی فەرموودە:**

١- بەرەکەتی خۆبەدەستەوەدان بۆ خودا، چونکە خاوەن ولاغەکە کاتێ بێ ئومێد بو لە دۆزینەوەی ولاغەکەی خۆی تەسلیمی مردن کرد، ئنجا خودا ولاغەکەی بۆ گەڕاندەوە.

٢- ئەوەی پشت بە جگە لە خودا ببەستێ پێویستترین شتی لەدەست دەدات، هەروەکو چۆن خاوەنی ولاغەکە لە بیاباندا پشتی بەو خواردن وخواردنەوەیە بەستبو، کە لەسەر پشتی ولاغەکەی بو، جا کاتێ پێویستی پێی بو، دەستی نەکەوت.

٣- هێنانەوەی نموونە بۆ نزیککردنەوەی زانیاریەکان لە ئەقڵەکان، ئەمەش شێوازێکی گرنگی پەروەردەو فێرکردنە.

- أخبرنا أبو عبدالله الحافظ، أنا أبو النضر الفقيه، ثنا محمد بن أيوب، أنا أبو الوليد الطيالسي، ثنا همام ابن يحيى، قال : سمعت إسحاق بن عبد الله بن أبي طلحة، يقول: سمعت عبد

الرحمن بن أبي عمرة، يقول: سمعت أبا هريرة يقول: سمعت رسول الله ﷺ يقول:" إن عبدا أصاب ذنبا، فقال: يا رب، إني أذنبت ذنبا فاغفره لي، فقال ربُّه: علم عبدي أن له ربا يغفر الذنب ويأخذ به، فغفر له، ثم مكث ما شاء الله، ثم أصاب ذنبا آخر، وربما قال: ثم أذنب ذنبا آخر، فقال: يا رب، إني أذنبت ذنبا آخر فاغفره لي، فقال ربُّه: علم عبدي أن له ربا يغفر الذنب ويأخذ به، فغفر له، ثم مكث ما شاء الله، ثم أصاب ذنبا آخر، وربما قال: ثم أذنب ذنبا آخر، فقال: يا رب، إني أذنبت ذنبا آخر فاغفره لي، فقال ربه: علم عبدي أن له ربا يغفر الذنب ويأخذ به، غفرت لعبدي فليعمل ما شاء ". رواه البخاري عن أحمد بن إسحاق، عن عمرو بن عاصم، عن همام، ورواه مسلم عن عبد بن حميد، عن أبي الوليد.

**واتای فەرمودە:**

بەندەیەك – لە ئوممەتی پێغەمبەر ﷺ یان لە ئوممەتانی پێشو – گوناهێكی كرد، وتی: ئەی پەروەردگارم، من گوناهێكم كردووە، جا لێم خۆشبە، پەروەردگارەكەی فەرمووی: بەندەكەم زانی كە پەروەردگارێكی هەیە لە گوناهەكان خۆش دەبێت و بەندەی لەسەر سزا دەدات، بۆیە خودا لێی خۆش بو، پاشان ماوەیەك ئەوەندەی خودا حەزی كرد لەسەر تۆبەكەی ماوە ، ئنجا گوناهێكی تری كرد، وتی: ئەی پەروەردگارم! من گوناهێكی ترم كرد، لێم خۆشبە، پەروەردگارەكەی فەرموی: بەندەكەم زانی كە پەروەردگارێكی هەیە لە گوناهەكان خۆش دەبێت و بەندەی لەسەر سزا دەدات، بۆیە خودا لێی خۆش بو، پاشان ماوەیەك ئەوەندەی خودا حەزی كرد لەسەر تۆبەكەی ماوە، ئنجا گوناهێكی تری كرد، وتی: ئەی پەروەردگارم! من گوناهێكی ترم كرد، لێم خۆشبە، پەروەردگارەكەی فەرموی: بەندەكەم زانی كە پەروەردگارێكی هەیە لە گوناهەكان خۆش دەبێت و بەندەی لەسەر سزا دەدات، لە بەندەم خۆش بوم، ئەوەی حەز دەكا با بیكات – واتە مادەم بەم شێوەیە داوای لێخوشبوون لەمن دەكات ، مەبەستیش ئەو گوناهانەن كە پەیوەستن بە مافەكانی خوداوە نەك مافەكانی بەندەوە–.

**لە سودەكانی فەرمودە:**

١– گەورەیی لێخوشبونی خودا لە بەندەكانی ، مادەم ئەوان پەنا بۆ ئەو دەبەن و داوای لێخوشبون لەو دەكەن.

٢– مەبەست لە برگەی " فليعمل ما يشاء " ، واتە ئەگەر چەند گوناه بكەی و داوای لێخوشبون لەمن بكەی، من لێت خۆش دەبم، هەروا دەرخستنی گرنگیدانی خودایە بەو بەندانەی دەگەڕێنەوە لای خوداو ، كەرەتێكی تر ملكەچی فەرمانەكانی دەبن.

٣– پێشەوا ( النووی ) دەڵێ: " لەم فەرمودەیە وەردەگیرێ كە گوناهەكان ئەگەر سەد جاریش دوبارەببنەوە، بەڵكو هەزار جار یان زیاتریش ، لە هەر جارێكیشیاندا تۆبەی كرد ، تۆبەی قبوڵەو، ئەگەر یەكجاریش لە گشت گوناهەكان تۆبەی كرد ، تۆبەكەی دروستە". مرقاة المفاتيح ، ٥/ ٢٤٣.

## الباب الثالث: في إرضاء الخصم، وإرضاء الخصم من شرائط التوبة

## بابەتی سێیەم: ڕازیکردنی ناکۆککار، ڕازیکردنی ناکۆککار لە مەرجەکانی قبوڵ بونی تۆبەیە

– أخبرنا أبو القاسم، عبد الرحمن بن عبيد الله الحرقي، ببغداد، ثنا حبيب بن الحسن بن داود القزاز، ثنا أبو بكر عمر بن حفص بن عمر بن يزيد السدوسي، ثنا عاصم بن علي، ثنا ابن أبي ذئب عن المقبري عن أبي هريرة ﷺ ، عن رسول الله ﷺ قال: " **من كانت عنده مَظلمة من أخيه من عِرضه، وماله، فليتحلّلها من صاحبه ، من قبل أن تُؤخذ منه، حين لا يكون دينار ولا درهم، فإن كان له عمل صالح، أخذ منه بقدر مظلمته، وإن لم يكن له ، أخذ من سيئات صاحبه، فحُمِلت عليه** " . رواه البخاري عن آدم بن أبي إياس، عن ابن أبي ذئب.

**واتای فەرمودە:**

هەر کەسێك ستەمکاریەکی لەلابو بۆ براکەی – واتە ستەمی لە کەسێك کردبو –، جا ستەمکاریەکە لە ڕووی ناموسەوە بێ، یان ماڵ بێ، با شتەکە بگەڕێنێتەوە بۆ خاوەنەکەی یان خاوەن شتەکە گەردەنی ئەو ئازا بکات، پێش ئەوەی لە ڕۆژی قیامەتدا لێی بسەندرێتەوە، کاتێك هیچ دینارو دیرهەم نابن، جا ئەگەر کردەوەی باشی هەبون، بەئەندازەی ستەمکاریەکەی لە کردەوە باشەکانی وەردەگیرێت ، ئەگەر کردەوەی باشیشی نەبون، ئەوە لە خراپەکانی ستەملێکراوەکە وەردەگیرێن و، فڕە دەدرێنە سەر ستەمکارەکە.

**لە سودەکانی فەرمودە:**

١– ستەم نەکردن لە خەڵك .

٢– ئەگەر ستەمێکت لە یەکێك کرد، لە دنیادا گوناهی ستەمەکەت بسڕەوە، بە گەڕاندنەوەی شتە زەوتکراوەکە بۆ خاوەنەکەی، یان گەردەن ئازا کردن.

٣– ئیسلام گرنگیەکی زۆری بە مافەکانی بەندە داوە ، ئەگەر ئەو کەسەی مافی خەڵك بەناحەق دەخوات لە دنیاش ڕزگاری ببێ، ئەوا لە قیامەتدا ڕزگاربوونی نییە.

## الباب الرابع : في هجران إخوان السوء ، وهجران إخوان السوء من كمال التوبة

## بابەتی چوارەم: وازهێنان لە برادەری خراپ، وازهێنان لە برادەری خراپ لە تێروتەسەلی تۆبەیە

– أخبرنا محمد بن عبد الله الحافظ، و محمد بن موسى بن الفضل، قالا: ثنا أبو العباس محمد بن يعقوب، ثنا أحمد بن عبد الحميد الحارثي، ثنا أبو أسامة ، عن بريد، عن أبي بردة، عن أبي موسى، عن النبي ﷺ قال:" **إنمَا مثل جليسِ الصالح وجليس السوء، كحامل المسك ونافخ الكير، حامل المسك، إما أن يُحذيك، وإما أن تَبتاع منه، وإما أن تجد منه ريحا طيبة، ونافخ الكير، إما أن**

**يُحرِق ثيابك، وإما أن تجد منه ريحا خبيثة "**. رواه البخاري ومسلم عن أبي كريب، عن أبي أسامة.

**واتای فەرمودە:**

نمونەی برادەری باش و برادەری خراپ، وەکو هەڵگری میسك و کوورەی ئاسنگەرە، هەڵگری میسك، یان بۆنی میسکت پێدەدا، یان میسکی لێ دەکڕی، یان بۆنێکی خۆشت لێ بەدەستدەکەوێت، کوورەی ئاسنگەر، یان پۆشاکت دەسوتێنێ، یان بۆنێکی پیست پێدەدات.

**لە سودەکانی فەرمودە:**

١- قەدەغەکردن لە دانیشتن دەگەڵ کەسانی خراپ ، لە ڕووی دین و دنیاوەو، هاندان بۆ دانیشتن لەگەڵ کەسانی باش و سودبەخش.

٢- میسك پاکەو فرۆشتنی دروستە، چونکە پێغەمبەر ﷺمەدحی کردووەو بەکاری هێناوە.

٣- هێنانەوەی نموونە بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی شتە مەبەستدارەکان و، نزیککردنەوەی زانیاریەکان لە ئەقڵ.

٤- بایەخدانی ئیسلام بە بوونی توخمی سودبەخش لە کۆمەڵگاداو، قەڵاچۆکردنی توخمە خراپەکان .

## الباب الخامس :في غض البصر، وكف الأذى، وحفظ اللسان

## بابەتی پێنجەم: نەزەر نەکردن و، ئازارنەدانی خەڵك و، پاراستنی زبان

– أخبرنا أبو طاهر الفقيه، ثنا أبو طاهر محمد بن الحسن المحمد أبادي، ثنا أبو قلابة، ثنا ابو عامر، ثنا زهير بن محمد ، ح وأخبرنا أبو طاهر، واللفظ لحديثه هذا، ثنا أبو بكر محمد بن إبراهيم الفحام، ثنا محمد بن يحيى، ثنا موسى بن مسعود، ثنا زهير بن محمد، عن زيد بن أسلم، عن عطاء بن يسار عن أبي سعيد الخدري، أن النبي ﷺ قال:**" إياكم والجلوس بالطرقات"**. قالوا: يا رسول الله! مالنا من مجالسنا بُدّ نتحدث فيها، فقال رسول الله ﷺ :**" إذا أبيتم إلا المجلسَ، فأعطوا الطريق حقه"**، قالوا: وما حق الطريق؟ قال : **"غض البصر، وكف الأذى، ورد السلام، والأمر بالمعروف، والنهي عن المنكر"**.

رواه البخاري، عن عبد الله بن محمد، عن أبي عامر، وأخرجه مسلم من حديث هشام بن سعد، عن زيد بن أسلم.

**واتای فەرمودە:**

وریابن لەسەر ڕێگاکان دامەنیشن. وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! ئێمە پێویستیمان بە دانیشتنە لەسەر ڕێگاکان بۆ ئاخاوتن لەمەڕ کاروبارەکانمان، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: ئەگەر هەر دادەنیشن، مافی ڕێگاکە بدەن. وتیان: ئایا مافی ڕێگا چییە؟ فەرموی: چاونوقاندن لە حەرام، ئازارنەدانی خەڵك ، وەڵام دانەوەی سەلام، فەرمان کردن بە چاکە، جڵەوگیریکردن لە خراپە.

**لە سودەکانی فەرمودە:**

١- بایەخدانی ئیسلام بە شوێنە گشتییەکان و ڕێکخستنیان.

٢- ئەگەر مرۆڤ لەسەر ڕێگاو شۆستەکان وەستا، با نەزەر نەکاو، ئازاری خەڵك نەدا بەهەر جۆرێك بێ تەنانەت بەڕێگەگرتن بەوەستاندنی ئوتومبێل لەشوێنی نا گونجاوو ، ئەگەر یەکێك سەلامی لێکرد وەڵامی سەلامەکە بداتەوەو، فەرمان بە کاری باش بکاو، جڵەوگیری لە کاری خراپ بکات.

٣- سووربونی ئیسلام لەسەر سەلامەتی گیان و ماڵ و نامووس.

- أخبرنا أبو عبد الله الحافظ، ثنا أبو العباس محمد بن يعقوب، ثنا ابن عبد الله بن عبد الحكم، أنا ابن وهب، أنا عبد الرحمن بن شريح، عن محمد ابن سمير، قال الشيخ أحمد: كذا قاله ابن وهب، بالسين غير معجمة، وقال غيره : بالشين معجمة ، عن أبي علي الجنبي، عن أبي ريحانة، قال: خرجنا مع رسول الله ﷺ في غزوة، فذكر الحديث ، قال: ثم قال رسول الله ﷺ :" **حُرِّمت النارُ على عينٍ دمعتْ من خشية الله، حُرِّمت النار على عين سَهِرتْ في سبيل الله"** قال: ونسيت الثالثة، قال ابن شريح وهو عبد الرحمن بن شريح: وسمعته بعدَ، أنه قال: **"حرِّمت النار على عين غَضَّت من محارم الله، أو عينٍ فُقِئت في سبيل الله "**.

**واتای فەرمودە:**

ئاگری دۆزەخ حەرام کراوە - واتە ناچێتە ناویەوە - لەسەر چاوێك کە لەترسی خودا فرمێسکی ڕشتووە. ئاگری دۆزەخ حەرام کراوە لەسەر چاوێك کە شەونخۆنی کردووە لە ڕێگەی خوادا. هەروا ئاگری دۆزەخ حەرام کراوە لەسەر چاوێك کە خۆی پاراستووە لەو شتانەی خودا حەرامی کردووە، یان چاوێك لە پێناو خوادا کوێر بوە.

**لە سودەکانی فەرمودە:**

١- گەورەیی گریان لە ترسی خوداو، شەونخۆنیکردن لەڕێگەی خوداداو، پاراستنی چاو لە تەماشاکردنی حەرام و، لەدەستدانی چاو لە ڕێگەی خوادا.

٢- ئەم چوار ڕەوشتانەی باسکران، مرۆڤی دەپارێزن لە ئاگری دۆزەخ.

- أخبرنا محمد بن عبد الله الحافظ، ثنا أبو عبد الله محمد بن يعقوب، ثنا إبراهيم بن عبد الله، أنا أبو عاصم، عن ابن جريج، أنا أبو الزبير، أنه سمع جابرا يقول: قال النبي ﷺ : **" المسلم من سلم المسلمون من لسانه ويده"**. رواه مسلم عن الحلواني، وعبد ابن حميد، عن أبي عاصم، وأخرجه البخاري من حديث عبد الله بن عمرو.

**واتای فەرمودە:**

موسڵمان ئەو کەسەیە کە موسڵمانان لە زبان و دەستی پارێزراو دەبن.

لە سودەکانی فەرمودە:

١- پێویستە موسڵمان ئازاری موسڵمان نەدا، بۆیەش زبان و دەستی باسکرد، چونکە زۆربەی کارەکان بەهەردووکیان ئەنجام دەدرێن و، دەبێ موسڵمان نە بە زبانی نە بە دەستی زەرەر لەخەڵك نەدات.

٢- موسڵمان سونبولی ئاشتیە لەسەر زەویدا.

- أخبرنا أبو الحسين علي بن محمد بن بشران المعدل، ببغداد، أنا إسماعيل بن محمد الصفار، ثنا زكريا بن يحيى بن أسد ، وأخبرنا أبو محمد عبد الله بن يحيى بن عبد الجبار السكرين ببغداد، أنا إسماعيل بن محمد، ثنا سعد ابن نصر قالا: ثنا سفيان بن عيينة، عن عمرو بن دينار، عن نافع بن جبير بن مطعم، عن أبي شريح الخزاعي قال: قال رسول الله ﷺ :" **من كان يومن بالله واليوم الآخر فليُكرِم ضيفه، ومن كان يؤمن بالله واليوم الآخر فليحسن إلى جاره، ومن كان يؤمن بالله واليوم الآخر فليَقل خيراً أو لِيصمُت**" وفي رواية زكريا " **أو لِيسكت**". رواه مسلم عن زهير بن حرب ، وابن نمير، عن سفيان بن عيينة، وأخرجه البخاري ومسلم من حديث المقبري، عن أبي شريح.

**واتای فەرمودە:**

هەر کەسێك بڕوای بەخوداو دوارۆژ هەیە با ڕێز لە میوانەکەی بگرێ، هەر کەسێك بڕوای بەخوداو دوارۆژ هەیە با چاکە دەگەڵ دراوسێیەکەی بکات، هەر کەسێك بڕوای بەخوداو دوارۆژ هەیە با قسەی چاك بکات، یان بێدەنگ بێت.

**لە سودەکانی فەرمودە:**

١- ڕێزگرتنی میوان، ئەم ڕێزگرتنەش بەوە دەبێت ، کە بە ڕوو گەش و قسەی خۆش هەڵسوکەوت دەگەڵ میوانەکەی بکاو، بۆ سێ ڕۆژ خواردنی پێبدات.

٢- چاکەکردن دەگەڵ دراوسێ، بە یارمەتیدانی ئەگەر داوای یارمەتی کرد، قەرز پێدانی ئەگەر داوای قەرزی کرد، ئەگەر نەخۆش کەوت سەردانی بکەی، ئەگەر مرد بەدوای جەنازەیدا بڕۆی، ئەگەر دڵخۆشیەکەی پێگەیشت پیرۆزبایی لێبکەی، ئەگەر ناخۆشیەکی پێگەیشت دڵی بدەیەوە...

٣- مرۆڤ بەرپرسیارە لە هەر قسەیەك دەیکات، بۆیە پێویستە کاتێ مرۆڤ قسە دەکات، قسەی چاك بکا، یان بێدەنگ بێ، چونکە بێدەنگی باشترە ، نەك قسەکردنی خراپ.

پێشەوا ( شافعی) دەڵێ :" ئەگەر ویستی قسە بکات با بروانێت: ئەگەر بۆی دیار بو کە قسەکە هیچ زەرەرەی بۆ سەر ئەو نیە با قسەکە بکات، بەلأم ئەگەر بۆی دەرکەوت کە قسەکە زەرەری تێدایە یان گومانی لە قسەکە هەبو، با قسەکە نەکات" . صحيح مسلم بشرح النووي، ٢/١٩.

## الباب السادس: في ترك ما يشغل عن ذكر الله تعالى

## بابەتی شەشەم: وازهێنان لە هەر شتێك كە مرۆڤ دووربخاتەوە لە زیكری خودای پایەبەرز

– أخبرنا أبو عبد الله الحافظ، أنا أبو العباس محمد بن أحمد المحبوبي، بمرو، ثنا سعيد بن مسعود، ثنا النضر بن شميل، أنا شعبة بن الحجاج، عن عبد الملك بن عمير، قال: سمعت أبا سلمة يقول: عن أبي هريرة ﷺ أن رسول الله ﷺ قال:" **إن أصدقَ بيت قاله الشعراءُ: ألا كل شيء ما خلا اللهَ باطلُ** ". روياه في الصحيح عن أبي موسى، عن غندر، عن شعبة.

**واتای فەرموده:**

ڕاسترین دێره هۆنراوه، كه هۆنەرمەندەكان گوتویانه، ئەم دێره هۆنراوەیەیه: ئاگاداربن! هەمو شتێك جگه له خودا لەناوچووه.

**له سودەكانی فەرموده:**

١– گوتن و نووسینی هۆنراوه حەلاله ، مادەم قسەی خراپ لەخۆ ناگرێت، چونكه هۆنراوه قسەیه، باشەكەی باشەو، خراپەكەی خراپه. عیمرانی كوری حوسەین دەڵێ : " هۆنراوه قسەیه، قسەش دروست و نادروستی تێدایه" . شرح السنة، ١٢/ ٣٦٩.

– أخبرنا أبو محمد عبد الله بن يوسف الأصبهاني، أنا أبو سعيد بن الأعرابي، ثنا سعدان بن نصر، ثنا أبو معاوية عن هشام بن عروة، عن أبيه، عن عائشة رضي الله تعالى عنها قالت: كان لرسول الله ﷺ خمَيصة، لها أعلام، فأعطاها أبا جهم، وأخذ منه أنبجانيّة، فقالوا: يا رسول الله! إن الخميصة خير من الأنبجانية، قال:" **إني كنت أنظر إلى عَلَمها في الصلاة**". رواه مسلم في الصحيح عن أبي بكر بن أبي شيبة، عن وكيع عن هشام، وأخرجاه من حديث الزهري عن عروة.

وفي رواية يونس بن يزيد عن الزهري:" **فإنها ألهتني في صلاتي** ". ورواه علقمة بن أبي علقمة، عن أمه، عن عائشة وقال فيه:" **فإني نظرت إلى عَلَمها في الصلاة، فكاد أن يفتِنَني**".

**واتای فەرموده:**

پێغەمبەری خودا ﷺ پۆشاكێكی هەبو له سوف دروستكرابو، كه چەند نیشانەیەكی لەسەر بو، جا ئەم پۆشاكەی به ئەبو جەهم داو، پۆشاكێكی ئەستووری لێوەرگرت، كه هیچ نیشانەی لەسەر نەبو، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! پۆشاكی یەكەم له هی دووەم باشتره، فەرموی: من له نوێژدا تەماشای نیشانەكان و دروشمەكانی ئەو پۆشاكەم دەكرد. له گێردراوەیەكی تردا فەرموی: ئەو پۆشاكه منی له نوێژەكەم خافڵ كرد. له گێردراوەیەكی تردا فەرموی: من كه تەماشای نیشانەكەی ئەو پۆشاكەم كرد، نێزیك بو من له ناوەرۆكی نوێژەكه دووربخاتەوەو ملكەچیم نەمێنێ.

**له سودەكانی فەرموده:**

١– هاندانی نوێژخوێن، كه ئاگای له نوێژەكەی بێ و، دیقەت بداته ناوەرۆكەكەی.

٢- نوێژخوێن خۆی خەریك نەكا بەهەر شتێك كە لە نوێژەكەی دوری بخاتەوەو، لابردنی ئەو شتەش كە دەبێتە هۆی دورخستنەوە لە كرۆك و كاكڵی نوێژ، كە ملكەچییە.

٣- نوێژ دروست دەبێ، ئەگەر لە نوێژەكەشدا هزری نوێژكەر بەشتێك خەریك بو ، كە پەیوەندی بە نوێژەوە نەبو.

٤- دروستە نوێژكردن لە پۆشاكێكدا كە نیشانەو دروشمی لەسەرن، بەلآم ئەگەر نوێژ لە پۆشاكێكی تردا بكات باشترە.

٥- قبوڵكردنی دیاری لە برادەران و ناردنی دیاری بۆیان.

- أخبرنا أبو طاهر الفقيه، أنا محمد بن الحسين القطان، ثنا أحمد بن يوسف السلمي، ثنا عبد الرزاق، أنا معمر عن الزهري، عن علي بن الحسين قال: قال رسول الله ﷺ :**"من حُسن إسلام المرء تركه مالا يعنيه"**. قال: وحدثنا أحمد، ثنا أبو نعيم، ثنا مالك، قال: وثنا يحيى بن يحيى والقعنبي وابن أبي أويس عن مالك عن الزهري، عن علي بن الحسين، عن النبي ﷺ بنحوه. هذا هو الصحيح مرسلا.

**واتای فەرمودە:**

لە تەواوی و كۆی جوانیەكانی ئیسلامی مرۆڤە، كە هەمو ئەو قسەو كردارو هزرانە فەرامۆش بكات، كە پەیوەندی بە ئەوەوە نیەو شایەنی ئەو نین.

لە سودەكانی فەرمودە:

١- ئەم فەرمودەیە یەكێكە لەو سێ فەرمودانەی كە ئیسلامی لەسەر دەسوورێتەوە، دووەكانی تریش ، فەرمودەی " إنما الأعمال بالنيات " و " الحلال بين والحرام بين ".

٢- تێروتەسەلی و كامڵی ئیسلام لەوەدایە ، كە مرۆڤ خۆی سەرقاڵ نەكا بەهەر قسەو كردارو رەفتارێك ، كە پەیوەندیان بە ئەوەوە نییە.

٣- سەلامەتی موسڵمان لە پراكتیزەكردنی ئەم فەرمودەدایە، چونكە وازهێنان لەو قسەو كردارانەی كە پەیوەندیان بە مرۆڤەوە نییە، پێگەی جوان دەكەن لەلایەن خوداو، لەلایەن خەڵك.

- وقد أخبرنا أبو علي الحسين بن محمد الروزباري، وأبو إسحاق إبراهيم بن محمد بن إبراهيم الفقيه الطوسي، وأبو القاسم علي بن الحسن الطهماني، وأبو بكر محمد بن محمد بن رجاء الأديب، قالوا: ثنا أبو العباس محمد بن يعقوب، أنا العباس بن الوليد بن مزيد، ثنا أبي ثنا الأوزاعي، حدثني قرة بن عبد الرحمن عن الزهري، عن أبي سلمة، عن أبي هريرة ﷺ أن رسول الله ﷺ قال:**" من حسن إسلام المرء تركه مالا يعنيه"**.

## الباب السابع:في الإستقامة

## بابەتی حەوتەم: بەردەوامبون و دامەزران لەسەر پەرستنی خوا

– أخبرنا أبو عبد الله الحافظ، ثنا علي بن عيسى، ثنا إبراهيم بن أبي طالب، ثنا إسحاق، وأخبرنا أبو صالح بن أبي طاهر العنبري ابن بنت يحيى ابن منصور القاضي، أنا جدي، يحيى بن منصور، ثنا أحمد بن سلمة، ثنا إسحاق، ثنا جرير عن هشام، عن أبيه عن سفيان بن عبد الله نه قال: قلت يا رسول الله! قل لي في الإسلام قولا لا اسأل عنه أحدا بعدك. قال: **"قل آمنت بالله، ثم استقم"**.رواه مسلم عن إسحاق بن إبراهيم.

**واتای فەرمودە:**

سوفیانی کوڕی عەبدوللاّ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا! قسەیەکم دەربارەی ڕێبیرەکانی ئیسلام نیشان بدە ، کە لە دوای تۆ پێویستم نەبێ لە هیچ یەکێك بپرسم؟ فەرموی: بلێ : بڕوام بەخودا هێناوە، ئنجا لەسەر گوێڕایەلی کردنی خوداو پێغەمبەرەکەی ﷺبەردەوام بەو جێگیر ببەو لەڕێگەی ئیسلام لامەدە.

**لە سودەکانی فەرمودە:**

١– ئەم فەرمودەیە لە کۆکەرەوەی وشەیە ، کە بنچینەکانی ئیسلام دەگرێتە خۆ لە: یەکتاپەرستی و پەرستش.

٢– پێویستە موسلّمان هەمیشە گوێڕایەلی فەرمانەکانی خودای مەزن و پێغەمبەرەکەی ﷺببێت.

٣– سووربونی یاوەرانی پێغەمبەر ﷺ لەسەر فێربونی یاساکانی ئیسلام.

أخبرنا أبو محمد الحسن بن علي بن المؤمل، ثنا أبو عثمان عمرو بن عبد الله البصري، ثنا محمد بن عبد الوهاب الفرا، ثنا يعلى بن عبيد، ثنا الأعمش عن سالم، يعني ابن أبي الجعد، عن ثوبان قال: قال رسول الله ﷺ :**" إستقيموا ولن تُحصوا، واعلموا أن أفضل أعمالكم الصلاة، ولا يحافظ على الوضوء إلا مؤمن "**. ورواه ليث بن أبي سليم عن مجاهد، عن عبد الله بن عمرو، عن النبي ﷺ **هكذا** .

– وأخبرناه أبو الحسين محمد بن علي بن خشيش المقري، بالكوفة، ثنا أبو جعفر بن دحيم، إملاءً، أنا ابو عمرو أحمد بن حازم بن أبي غرزة، أنا عبيد الله بن موسى، أنا شيبان عن ليث فذكره.

**واتای فەرمودە:**

شوێن حەق بکەون و لەسەر ڕێگەی ڕاست بەردەوام و جێگیربن، بەلاّم ئەمەشتان هەرگیز لەتوانادا نیە، چونکە ئیستیقامە کارێکی قورسە، وەلێ کۆششەکانتان بخەنە گەر لە پەرستنی خودادا ئەوەندەی دەتوانن. بزانن! باشترین کردەوەتان – بۆ ئیستیقامە – نوێژە، – چونکە نوێژ دایکی پەرستشەکانەو، قەدەغەکاری گوناهەکانە – . هیچ یەکێکیش پارێزگاری لەسەر دەستنوێژ

ناکات مەگەر بڕواداریکی تەواو نەبێ ، کە هەمیشە پەیوەندی هەیە لەگەڵ خودای خۆی.

**لە سودەکانی فەرمودە:**

١- گەورەیی ئیستیقامە و پارێزگاریکردن لەسەری کارێکی قورسەو کەسی خۆی دەوێ.

٢- نوێژ کردەوەیەکی گەورەیە و یاریدەدەری موسڵمانە بۆ بەردەوام بون لەسەر ڕێگەی راستی ئیسلام.

٣- دەستنوێژ هۆکارێکە بۆ ئیستیقامە و تەنها بڕوادار دەتوانێ پارێزگاری لەسەر دەستنوێژ بکا.

## الباب الثامن: في دوام المراقبة

## بابەتی هەشتەم: هەمیشە خودا چاودێری دەکا

– أخبرنا أبو الحسين بن بشران، أنا أبو جعفر الرزاز، ثنا عيسى بن عبد الله الطيالسي، ثنا أبو عبد الرحمن المقري، ثنا كهمس بن الحسنن قال : سمعت عبد الله بن بريدة ، يحدث عن يحيى بن يعمر، عن عبد الله بن عمر، عن أبيه في حديث الإيمان، قال الرجل: يا محمد! أخبرني عن الإسلام، ما الإسلام؟ قال رسول الله ﷺ :" **الإسلام أن تشهد أن لا إله إلا الله، وأن محمدا عبده ورسوله، وتقيمَ الصلاة، وتؤتي الزكاة، وتصوم رمضان، وتحج البيت، إن استطعتَ السبيل**". قال الرجل: صدقت، ثم قال: يا محمد! أخبرني عن الإيمان، ما الإيمان؟ فقال:" **الإيمان: أن تؤمن بالله، وملائكته وكتبه، ورسله، واليوم الآخر، والقدر كلِّه، خيرِه وشرِه**". فقال: صدقت، ثم قال: أخبرني عن الإحسان، ما الإحسان؟ فقال:" **الإحسان أن تعبد الله كأنك تراه فإن لم تكن تراه فإنه يراك**". وذكر باقي الحديث. أخرج مسلم الحديث من أوجه عن كهمس، وأخرجه البخاري ومسلم من حديث أبي هريرة ﷺ عن النبي ﷺ .

**واتای فەرمودە:**

پیاوەکە – جبرائیل– وتی: ئەی موحەممەد! ئیسلامم بۆ ڕوون بکەوە، ئیسلام چییە؟ پێغەمبەری خوا فەرموی: ئیسلام بریتیە لە شاهیدی دان کە هیچ خوایەك نیە جگە لە ( الله ) و، موحەممەدیش بەندەو پێغەمبەری ئەوەو، پێنج نوێژە واجبەکان بکەی و،زەکات بدەی و، لە مانگی ڕەمەزاندا بە ڕۆژوو ببی و، حەجی ماڵی خوا بکەی، ئەگەر لەتواناتدا بو. پیاوەکە وتی: راستت فەرموو، ئنجا وتی: ئەی موحەممەد! بڕوام بۆ ڕوون بکەوە، بڕوا چییە؟ فەرموی: بڕوا بریتیە لە بڕوا هەبون بە خوداو، فریشتەکانی و ، کتێبەکانی و، پێغەمبەرەکانی و، ڕۆژی دوایی و، گشت قەدەرەکانی خودا، باش و خراپەکەی . وتی: راستت فەرموو، ئنجا وتی: چاکەم بۆ ڕون بکەوە، چاکە چییە؟ فەرموی: چاکە بریتیە لە پەرستنی خوا بە جۆرێك کە تۆ ئەو دەبینی، ئەگەر تۆ ئەو نابینی، خۆ ئەو تۆ دەبینێ.

**لە سودەکانی فەرمودە:**

١- پێشەوا ( قاضی عیاض ) دەڵێ:" ئەم فەرمودەیە ڕاڤەی گشت پیشەکانی پەرستشتەکانی

دیارو پەنهانی لە خۆ گرتووە، لە گرێبەستەکانی بڕواو، کردەوەکانی ئەندامەکان و، دڵسوزی لە نهێنیەکانداو، خۆپاراستن لە کارەساتی کردەوەکان، تەنانەت گشت زانستەکانی شەریعەت بۆ ئەم فەرمودەیە دەگەڕێنەوەوهەر لەم فەرمودەیەش دەڕژێن". شرح النووي على صحيح مسلم ، ١/١٥٨.

٢- ئیسلام لە پێنج پایە پێك دێت: شایەتومان ، نوێژ، زەکات ، ڕۆژوو، حەج.

٣- بڕوا لە شەش پایە پێك دێت: بڕوا بوون بە خودا، بە فریشتەکانی ، بە کتێبەکانی ، بە پێغەمبەرەکانی ، بە دوا ڕۆژ، بە قەزاو قەدەر.

٤- هاندانی موسڵمان کە پەرستشەکانی بە دڵسوزیەوە بکات و، بزانێ خودای مەزن ئەو دەبینێ، جا گەرەکە زیاتر ملکەچیەکەی نیشان بدا.

- أخبرنا محمد بن عبد الله الحافظ، ثنا أبو العباس محمد بن يعقوب، ثنا يزيد بن عبد الصمد الدمشقي، ثنا نعيم بن حماد، ثنا عثمان بن كثير بن دينار، عن محمد بن مهاجر، عن عروة بن رويم اللخمي، عن عبد الرحمن بن غنم، عن عبادة بن الصامت قال: قال رسول الله ﷺ :" إن من أفضل إيمان المرء أن يعلم: أن الله معه حيث كان".

قال الشيخ أحمد: يعني أن الله معه بعلمه.

**واتای فەرمودە:**

باشترین بڕوای مرۆڤ ئەوەیە کە بزانێت: خودا لەگەڵ ئەوە -بەزانستەکەی- لەهەر کوێیەك بێت.

## الباب التاسع: في الحياء من الله عز وجل

## بابەتی نۆیەم: شەرمکردن لە خودای پایەبەرز

- أخبرنا السيد أبو الحسن محمد بن الحسين بن داود العلوي، أنا عبد الله بن محمد بن الحسن بن الشرقي، ثنا محمد بن يحيى الذهلي، ثنا عبد الرحمن ابن مهدي، عن مالك بن أنس، عن الزهري، عن سالم، عن ابن عمر أن النبي ﷺ : مرّ برجل، وهو يعظ أخاه في الحياء فقال:**" دعْهُ، فإن الحياء من الإيمان "**.رواه البخاري عن عبدالله بن يوسف، عن مالك، وأخرجه مسلم من حديث ابن عيينة ومعمر عن الزهري.

**واتای فەرمودە:**

پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای پیاوێکدا ڕۆیشت، کە ئامۆژگاری براکەی دەکرد دەربارەی شەرم و قەدەغەی دەکرد لە شەرمکردن و سەرزەنشتی دەکرد، پێغەمبەریش ﷺ فەرموی: وازی لێ بێنە، با بەردەوام بێت لەسەر شەرمکردن، چونکە شەرم پارچەیەکە لە بڕوا.

**لە سودەکانی فەرمودە:**

١- هاندان بۆ خۆدورگرتن لە کارە خراپەکان و شەرمکردن لە کردنیان.

٢- ئامۆژگاری کاتێك دەبێتە ئامۆژگاری، ئەگەر لەشوێن خۆی بێت.

- وأخرج مسلم حديث عمران بن حصين عن النبي ﷺ أنه قال:**" الحياءُ كلُّه خير، والحياء لا يأتي**

**إلا بخير".**

**واتای فەرمودە:**

شەرم گشتی باشە، ڕەوشتی شەرمیش تەنها چاكەو باشی بۆ خاوەنەكەی بەدەستدەهێنێت.

**لە سودەكانی فەرمودە:**

١- شەرم هۆكارێكە بۆ بەرزبونەوەی پلەوپایەی مرۆڤ، چونكە تەنها خێرو چاكەی لێ دەكەوێتەوە.

- أخبرنا أبو محمد جناح بن نذير بن جناح القاضي بالكوفة، ثنا أبوجعفر محمد بن علي بن دحيم، ثنا أحمد بن حازم بن أبي غرزة، ثنا محمد بن عبيد، ثنا أبان بن إسحاق عن الصباح بن محمد، عن مرة الهمداني، عن عبد الله ابن مسعود قال: قال رسول الله ﷺ: **" إستَحيُوا من الله حق الحياء".** قالوا: يا رسول الله! إنا لنستحْيِي من الله ، والحمد لله، قال:**" ليس ذاك ، ولكن من استحيا من الله حق الحياء، فلْيحفظِ الرأس وما وَعى، ولْيحفظ البطن وما حَوى، ولْيَذكُرِ الموتَ والبِلى، ومن أراد الآخرة، ترك زينة الدنيا، فمن فعل ذلك، فقد استحيا من الله حق الحياء ".** وروي في ذلك عن هشام، عن الحسن، عن النبي ﷺ مرسلا، وفيه تأكيد لهذا المسند.

**واتای فەرمودە:**

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموی بەیاوەرەكانی: بەتێروتەسەلی تەقوای خودا بكەن و شەرمی لێ بكەن. وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! وا تۆش دەبینی ئێمە تەقوای خودا دەكەین و شەرمی لێدەكەین و، سوپاس بۆ خودا ، فەرموی ﷺ : شەرمكردن بەتێروتەسەلی ئەوە نیە بە زبان بڵێن: ئێمە شەرم دەكەین و تەقوامان هەیە، ئەوەی بەتێروتەسەلی شەرم لە خودا دەكا، با سەری بپارێزێ بە نەچەماندنی بۆ كەس جگە لە خوداو، ئەوەی لەناو سەری دایە لە چاوو زبان و گوێ بپارێزی لە حەرام و، با زگی و ئەوەی پێیەوە نوساوە لە هەردوو دەستەكان و پێیەكان و دامێن ... بپارێزێ لە خواردن و كاری حەرام، با بیرەخۆی بێنێتەوە كاتێك دەمرێ و ڕزی دەبێت و، هەر كەسێكیش دوارۆژی ویست، واز لەجوانی دنیا دەهێنێت، ئەوەی هەمو ئەمەی سەرەوەی كرد ، ئەوە بەتێروتەسەلی لەخودا ترساوەو شەرمی لێدەكات.

لە سودەكانی فەرمودە:

١- شەرم كردنی تەواو بریتیە لە پاراستنی ئەندامەكانی لاشە لە سەرپێچی كردنی فەرمانەكانی خودای مەزن و دووركەوتنەوە لە گوناهەكان، چونكە خودا تۆ دەبینێ.

٢- بیركردنەوە لە مردن و خۆئامادەكردن بۆ مردن و دنیا نەویستی لە تێروتەسەلی شەرمكردنە لە خودا.

٣- گەورەیی شەرم كردن لە دیدی ئیسلامدا.

## الباب العاشر: في الخوف والرجاء

## بابەتی دەیەم: ترسان لەسزای خوداو ئومێد هەبون بە ڕەحمەتی خودا

– أخبرنا أبو عبد الله الحافظ، أخبرني محمد بن عبد الله بن قريش الوراق، ثنا الحسن بن سفيان، ثنا قتيبة، ثنا يعقوب بن عبد الرحمن، عن عمرو يعني ابن أبي عمرو، عن سعيد بن أبي سعيد، عن أبي هريرة ﷺ، قال سمعت رسول الله ﷺ يقول: **" إن الله تعالى خلقَ الرحمةَ، يومَ خلقها، مائةَ رحمةٍ، فأمسك عنده تسعا وتسعين رحمةً، وأرسل في خلقه كلِّهم رحمةً واحدةً، فلو يعلم الكافر كلَّ الذي عند الله من رحمته، لم يَيْأسْ من الرحمة، ولو يعلم المؤمن بكل الذي عند الله من العذاب، لم يأْمنْ من النار"**. رواه البخاري عن قتيبة بن سعيد، وأخرجه مسلم من وجه آخر عن أبي هريرة.

**واتای فەرموده:**

خودای پایەبەرز کاتێ ڕەحمەتی دروست کرد، بە سەد بەش یان جۆر دروستی کرد، جا نەوەدو نۆ بەشی ڕەحمەتی لای خۆی هێشتەوەو، یەك بەشی نارده ناو هەمو بەدیهێنراوەکانی، جا ئەگەر بێ باوەڕ زانیبایە هەمو ئەو ڕەحمەتەی لەلای خودا هەیە، بێ ئومێد نەدەبو لە ڕەحمەتەکە، ئەگەر باوەڕداریش زانیبایە هەمو ئەو سزایەی لەلای خودا هەیە، لە دۆزەخ ئەمین نەدەبو.

**لە سودەکانی فەرموده:**

١- زۆری ڕەحمەتی خودا.

٢- پێویستە مرۆڤی موسڵمان لەنێوان ئومێد و ترسدا بێت، ئومێدی بە ڕەحمەتی خودا هەبێ و، لە سزاکەشی بترسێ و، خۆی بەکاروکردەوەکانی فریو نەدات.

– حدثنا السيد أبو الحسن محمد بن الحسين بن داود العلوي، ثنا أبو حامد بن الشرقي، أملاه علينا من حفظه، ثنا محمد بن يحيى الذهلي، ثنا عبد الرحمن بن مهدي، ثنا سفيان عن منصور وسليمان الأعمش، عن أبي وائل عن عبد الله قال: قال رسول الله ﷺ: **" الجنةُ أقرب إلى أحدِكم من شِراكِ نَعْله، والنارُ مثلُ ذلك"**. رواه البخاري في الصحيح عن أبي حذيفة عن سفيان .

**واتای فەرموده:**

بەهەشت لە یەکێکتان نزیکترە لە قەیتانی نەعلەکەی، ئاگری دۆزەخیش بەهەمان شێوە.

**لە سودەکانی فەرموده:**

١- ئەم فەرمودەیە بەڵگەیە کە پەرستشەکان مرۆڤ لەبەهەشت نزیك دەکەنەوەو، گوناهەکانیش مرۆڤ لە دۆزەخ نزیك دەکەنەوە.

٢- پێویستە بڕوادار شتی باش بەکەم نەزانێ، ئەگەر شتێکی کەمیش بێ و، نابێ کەم شتێکی خراپیش بەهیچ وەرنەگرێ، چونکە بڕوادار نازانێ بە کامە چاکە خودا ڕەحمی پێدەکاو، بەکامە خراپە لێی تووڕە دەبێت.

– وروى سويد بن سعيد، عن حفص بن ميسرة ، عن زيد بن أسلم، عن ابن عمر أن رسول الله ﷺ قال :" **إنما يدخلُ الجنةَ من يرجوها، وإنما يُجَنَّب النارَ من يخافها، وإنما يرحمُ اللهُ من يرحم**". حدثناه الإمام أبو الطيب سهل بن محمد بن سلمان، ثنا أبو عمرو بن مطر، ثنا القاسم بن زكريا المطرز، ثنا سويد بن سعيد فذكره.

**واتای فەرمودە:**

ئەوانە دەچنە بەهەشتەوە، کە ئومێدی چونە بەهەشت دەکەن – کاری بۆ دەکەن –، هەروا ئەوانە لە ئاگری دۆزەخ دەپارێزرێن، کە دەترسن خودا بەو ئاگرە سزایان بدات، خودا ڕەحم بەو کەسەدەکات، کە ڕەحم بەخەڵك دەکات.

**لە سودەکانی فەرمودە:**

١– ئومێد بون بە ڕەحمەتی خوداو ، ترسان لە سزاکەی.

٢– ڕەحم کردن بە خەڵك دەبێتە هۆی ڕەحم کردنی خودا بە تۆ.

– وروى جعفر بن سليمان الضبعي، عن ثابت، عن أنس: أن النبي ﷺ دخل على رجل يعوده ، فوجده في الموت، فقال:" كيف تجِدُك؟"، فقال: أجدني أخاف وأرجو، – وفي روايةسَيَّارٍ– ، قال: أرجو الله، وأخاف ذنوبي، فقال:" لا يجتمعان في قلب مؤمن – زادَ سيارٌ– في مثل هذا الموطن، إلا أعطاه الله الذي يرجو، وأمَّنهُ من الذي يخاف ". أخبرناه علي بن أحمد بن عبدان، أنا أحمد بن عبيد الصفار، ثنا محمد بن إسحاق البغوي، ثنا يحيى بن عبد الحميد، ثنا جعفر بن سليمان، وأخبرنا أبو عبد الله الحافظ، وأبو محمد عبد الرحمن بن أبي حامد المقريء وأبو عبد الرحمن.

**واتای فەرمودە:**

پێغەمبەر ﷺ چووە لای پیاوێك بۆ سەردانی و، دیتی لە سەرەمەرگدایە، فەرموی ﷺ: چۆن خۆت دەبینی؟ وتی: من خۆم دەبینم لە سزای خودا دەترسم و ئومێدی ڕەحمەتەکەی دەکەم، – یان وتی: من ئومێدی ڕەحمەتی خودا دەکەم و، لە گوناهەکانیشم دەترسم–، فەرموی ﷺ: ئومێدکردنی ڕەحمەتی خوداو ترسان لەسزاکەی لەکاتی سەرەمەرگدا لە دڵی هەر بڕوادارێکدا بێت، مەگەر خودا ئەو ڕەحمەتەی پێدەبەخشێت کە ئومێدی دەکاو، ئەمینی دەکا لەو سزایەی لێی دەترسێ – بەلێخووشبونی–.

**لە سودەکانی فەرمودە:**

١– موسڵمان لەکاتی سەرەمەرگدا ئومێدی هەبێ بە ڕەحمەتی خوداو لە سزاکەشی بترسێ.

## الباب الحادي عشر: في قِصَر الأمل، والمبادرة بالعمل قبل بلوغ الأجل

## بابەتی یازدە: کورتی ئومێدو، خێراکردن لە کردەوەدا پێش گەیشتنە کاتی مردن

أخبرنا أبو عمرو محمد بن عبد الله البسطامي الأديب ، أنا أبو بكر أحمد بن إبراهيم الإسماعيلي، أخبرني الحسن وهو ابن سفيان ، ثنا المقدمي ، وهو محمد بن أبي بكر ، ثنا محمد بن

عبد الرحمن الطفاوي ، ثنا الأعمش ، عن مجاهد ، عن ابن عمر قال : أخذ رسول الله ﷺ بمنكبي، وقال : " **كُن في الدنيا كالغريب ، أو كعابرِ سبيلٍ** ".

قال : وكان ابن عمر يقول : " **إذا أصبحت فلا تنتظر المساءَ ، وإذا أمسيت فلا تنتظر الصباحَ، وخذ من صحتك لمرضك ، ومن حياتك لموتك** "، رواه البخاري عن علي بن المديني عن الطفاوي.

**واتای فەرموده:**

عەبدوللای کوڕی عومەر دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ شانی منی گرت و، فەرمووی: لە دنیادا وەکو کەسی نامۆ – واتە ئارەزووی دنیا مەکە و بە ولآتی خۆتی دامەنێ، چونکە بەجێی دەهێڵی بۆ قیامەت و تۆ گەشتیاری لەم دنیایەدا– ، یان ڕێبوار بە.

عەبدوللای کوڕی عومەر دەیگوت: ئەگەر بەیانیت کردەوە چاوەڕوانی ئێوارە مەکە، ئەگەر ئێوارەشت کردەوە چاوەڕوانی بەیانی مەکە، لەکاتی لەش ساغبونتدا زیاتر پەرستش بکە بۆ کاتی نەخۆش بونت، ژیانت بەفرسەت بزانەو کاری باشی تێدا بکە بۆ مردنت.

**لە سودەکانی فەرموده:**

ئەم فەرمودەیە هانی موسڵمان دەدات کە زۆر خۆی نەبەستێتەوە بە ژیانی دیناوەو، قەناعەتی هەبێ و، بەگوێرەی پێویستیەکانی ژیان لەم دنیایە وەربگرێ و، زۆر بەدوایدا نەچێ، چونکە لەناوچووە.

حدثنا السيد أبو الحسن محمد بن الحسين بن داود العلوي ، أنا أبو محمد عبد الله بن محمد بن الحسن ، ثنا عبد الله بن هاشم ، ثنا وكيع ، ثنا شعبة ، عن قتادة ، عن أنس بن مالك ﷺ قال : قال رسول الله ﷺ : " **يَهْرَمُ ابن آدم، ويبقى منه اثنتان : الحِرصُ والأملُ** ". أخرجاه من حديث شعبة. وهذا أخرجه مخرج الذم لعادته ، وينبغي أن يكون كما أُمر به ابن عمر ، وكما أوصى به ابن عمر ، وبالله التوفيق.

**واتای فەرموده:**

ئادەمیزاد پیر دەبێ ، وەلێ دووشت لەگەڵی دەمێننەوەو بەهێز دەبن: سووربون لەسەر ژیان و، هیواخواستنی هەبونی ماڵی دنیاو کۆکردنەوەی.

**لە سودەکانی فەرموده:**

پێغەمبەر ﷺ لەم فەرمودەدا لۆمەی ئەو کەسە دەکات، کە بەساڵاچووەو، هێشتا سوورە لەسەر دنیاو کۆکردنەوەی ماڵ بۆ دنیا، چونکە کە مرۆڤ بەساڵاچوو، پێویستە زیاتر دڵی لەلای دوارۆژی بێت نەک دنیای.

## الباب الثاني عشر: في الاجتهاد في طاعة الله عز وجل

## بابەتی دوازدە: کۆششکردن لە گوێرایەڵی خودای پایەبەرزدا

أخبرنا أبو عبد الله الحافظ ، حدثني عبد الله بن سعد الحافظ ، ثنا محمد بن إسحاق الثقفي ، ثنا محمد بن عثمان بن كرامة ، ثنا خالد بن مخلد ، عن سليمان بن بلال ، أخبرني شريك بن عبد الله بن أبي نمر ، عن عطاء ، عن أبي هريرة ﷺ قال : قال رسول الله ﷺ : " **إن الله عز وجل قال : من عادى لي وليا، فقد بارزني بالحرب ، وما تقرَّب إلي عبدي بشيء أحبُّ إلي مما افترضتُ عليه ، وما يزال يتقرب إلي بالنوافل حتى أُحبَّه ، فإذا أحببته كنت سمعه الذي يسمع به ، وبصره الذي يُبصِر به ، ويده التي يبطِش بها ، ورجله التي يمشي بها ، وإن سألني عبدي لأعطينه ، ولئن استعاذني لأعيذنه ، وما تردَّدتُ عن شيء أنا فاعله، ترددي عن نفس المؤمن، يكره الموت ، وأكرهُ مساءته** "، رواه البخاري عن محمد بن عثمان بن كرامة، ورواه أيضا عبد الواحد أبو حمزة ، مولى عروة ، عن عروة ، عن عائشة رضي الله عنها ، عن النبي ﷺ بمعناه ، يزيد فيه وينقص.

وقوله : " كنت سمعه الذي يسمع به " ، معناه: حفظ جوارحه عليه عن مواقعة ما يكره ، وقد يكون معناه ، والله أعلم : كنت أسرع إلى قضاء حوائجه من سمعه في الاستماع ، وبصره في النظر ، ويده في اللمس ، ورجله في المشي ، وقوله : " ما ترددت عن شيء أنا فاعله " يريد به ، والله أعلم ، ترديد ملائكته إليه ، أو بإشرافه في عمره على المهالك ، فيدعو الله فينجيه حتى يبلغ الكتاب أجله ويميته ، وقد أشار أبو سليمان الخطابي وغيره إلى معنى ما ذكرناه ، وقوله : " يكره الموت ، وأكره مساءته " يريد لما يلقى من عيان الموت وصعوبته ، وكربه ليس أنه يكره له الموت " لأن الموت مورده إلى رحمته ومغفرته ، وهذا فيما أخبرنا أبو عبد الله الحافظ ، ثنا جعفر بن محمد قال : قال الجنيد في معنى قوله : " يكره الموت ، وأكره مساءته " فذكره.

**واتای فەرمودە:**

خودای پایەبەرز دەفەرمێ: هەر کەسێك دوژمنایەتی خۆشەویستێکم بکا— ئەو کەسەی خودا دەناسێ و بەتێروتەسەلی و دڵسوزی دەیپەرستێ —، ئەوە جەنگی دەگەڵ من کردووە، بەندەم بەهیچ شتێك لێم نزیك نابێتەوە کە لای من خۆشەویست بێ، ئەوەندەی بە کردنی واجبەکان لێم نزیك دەبێتەوە، هەمیشە بەندەم لێم نزیك دەبێتەوە بەکردنی سوننەتەکان تاوەکو خۆشم دەوێ، جا کە خۆشم ویست، ئەندامەکانی — گوێ ، چاو، دەست ، پێ — دەپارێزم لە گوناهەکان و خراپەکان، پێداویستیەکانی بۆ دابین دەکەم، ئەگەر بەندەم داوای شتێکی لێ کردم پێیدەدەم، ئەگەر خۆی بەمن پاراست لەهەر شتێك لەو شتە دەیپارێزم، نەویستنی مردنی لەسەر لادەبەم و مردنی لەلا ئاسان بێت ، ئەو مردنی لەلا قورسە بە سروشتە مرۆڤایەتیەکەی و، منیش دەمەوێ بمرێ ، چونکە مردنی دەیگەیەنێتە ڕەحمەت و لێخووشبونی خودای مەزن.

**لە سودەکانی فەرمودە:**

١- مرۆڤی موسڵمان هەوڵدەدات خۆی زیاتر خۆشەویست بکا لەلای خودا و نزیك بێتەوە لێی بەکردنی سونەتەکان.

٢- مرۆڤی خوداناس و پیاو چاك ڕێزێکی گەورەی هەیە لەلای خودا.

٣- گەورەیی کۆششکردن لە پەرستنی خودادا.

## الباب الثالث عشر: في إخلاص العمل لله عز وجل، وترك الرياء

**بابەتی سێزدە: کردەوە کردن بەدڵسۆزی بۆخودای پایەبەرزو، وازهێنان لە پێش چاوی** (رياء)

أخبرنا أبو الحسن علي بن أحمد بن عبدان ، أنا أحمد بن عبيد الصفار ، ثنا الحارث بن محمد بن أبي أسامة التميمي ، ثنا يزيد بن هارون ، ثنا يحيى بن سعيد ، عن محمد بن إبراهيم ، أخبره أنه سمع علقمة بن وقاص يقول : إنه سمع عمر بن الخطاب ﷺ يقول : سمعت رسول الله ﷺ يقول : " **إنما الأعمال بالنية ، وإنما لامرئ ما نوى ، فمن كانت هجرته إلى الله ورسوله فهجرته إلى الله وإلى رسوله ، ومن كانت هجرته لدنيا يصيبها ، أو امرأة يتزوجها ، فهجرته إلى ما هاجر إليه** ". رواه مسلم عن ابن نمير عن يزيد بن هارون وأخرجه البخاري ، ومسلم ، من حديث مالك وغيره ، عن يحيى بن سعيد الأنصاري.

**واتای فەرمودە:**

کاروکردەوەکان پەیوەستن بە نیەتەوە، هەر کەسێکیش پاداشتی دەدرێتەوەو کارەکەی وەردەگیرێ بەگوێرەی نیەتەکەی، جا هەر کەسێك کۆچکردنی بۆ خوداو پێغەمبەرەکەی بو، ئەوە کۆچکردنەکەی بۆ خوداو پێغەمبەرەکەیەتی، هەر کەسێکیش کۆچکردنەکەی بۆ مەبەستی دنیایی بێ، یان بۆ ئەوەی ئافرەتێك مارە بکات، ئەوە کۆچکردنەکەی بۆ ئەو شتەیە.

**لە سودەکانی فەرمودە:**

١- پێشەوا ( النووي ) دەڵێ :" موسڵمانان یەکدەنگن لەسەر گەورەیی پلەوپایەی ئەم فەرمودەیەو سودە زۆرەکانی و ڕاستیەکەی. پێشەوا ( الشافعي ) و هەندێکی تر وتویانە: ئەم فەرمودەیە سێیەکی ئیسلامە . هەروا ( الشافعي ) وتویەتی : حەفتا باسی فیقهی لەخۆ دەگرێت". صحيح مسلم بشرح النووي، ١٣/ ٥٣.

٢- کاروکردەوەکان بە نیەت دروست دەبن و، بەبێ نیەت دروست نین وەکو دەستنوێژ ، خۆشۆردن ، ڕۆژوو ، نوێژ ، زەکات ، حەج ...

٣- گرنگی نیەت لە ئیسلامدا.

أخبرنا محمد بن عبد الله الحافظ ، ثنا أبو العباس محمد بن يعقوب ، ثنا محمد بن علي بن

ميمون الرقي ، وأبو أسامة عبد الله بن أسامة الكلبي قالا : ثنا عمر بن حفص بن غياث ، حدثني أبي ، عن إسماعيل بن سميع ، عن مسلم البطين ، عن سعيد بن جبير ، عن ابن عباس رضي الله عنهما قال : قال رسول الله ﷺ : **" من سمَّع سمَّع اللهُ به ، ومن رايَا، رايا الله به "**. رواه مسلم ، عن عمر بن حفص ، وأخرجاه من حديث جندب عن النبي ﷺ .

**واتاى فەرموده:**

هەر كەسێك كارێك بكا بەبێ دڵسوزى و بۆئەوەى خەڵك ببينن و مەدحى بكەن و بۆ ناوبانگى، خودا ئەو كەسە بۆ خەڵك ئاشكرا دەكا، هەر كەسێكيش كاروكردەوەكانى بەپێش چاوى ( رياء) بكا ، خودا بە خەڵكى نيشان دەدا ، كە ئەو كەسە كردەوەى لەبەر ئەوان كردووە نەك لەبەر خودا ، بۆيە لێى توورە دەبێت.

وروي عن عبد الله بن عمرو ، عن النبي ﷺ : **" من سمَّع الناس بعمله، سمع الله به سامِعَ خلقِه ، وصَغَّره ، وحقَّره "**.

**واتاى فەرموده:**

هەر كەسێك كاروكردەوەكانى بۆ ئەو مەبەستە بێت كە خەڵكى مەدحى بكەن و ڕياييان تێدا بكات، خودا ڕياييەكەى بۆ خەڵك ئاشكرادەكاو دەگەيەنێتە گوێيەكانى خەڵك كە ئەو كەسە ڕياكەرەو، زەليل و سووك و بێ قەدرى دەكا.

**لە سودى هەردوو فەرموودەكە:**

١- ئاگاداركردنەوەو ورياكردن لە پێش چاوى ( رياء) و دوركەوتنەوە لێى ، چونكە كردەوەيەكە مرۆڤ توشى توورەيى خودا دەكا.

٢- سوننەتە مرۆڤى موسڵمان كردەوە چاكەكانى بشارێتەوە، وەلێ هەندێك جار واباشە ئاشكرايان بكا، بۆ ئەو كەسەى دەيەوێ پەيڕەوى ئەو بكا.

وفيما روى العلاء بن عبد الرحمن ، عن أبيه ، عن أبي هريرة قال : قال رسول الله ﷺ : **" قال الله عز وجل : أنا أغنى الشركاء عن الشرك ، فمن عمِل لي عملا، أشرك فيه غيري فأنا منه بريء ، وهو للذي أشرك "**. أخبرناه أبو عبد الله الحافظ ، أنا أبو الحسن ابن بنت إبراهيم بن هانئ ، ثنا إبراهيم بن أبي طالب ، ثنا يعقوب الدورقي ، ثنا ابن علية ، ثنا روح بن القاسم ، عن العلاء ، فذكره . رواه مسلم عن زهير بن حرب عن إسماعيل ابن علية.

**واتاى فەرموده:**

خوداى پايەبەرز دەفەرمێ: من هيچ پێويستيەكم بە هاوبەش نيە - واتە هەر كاروكردەوەيەك تەنها بۆ من نەبێت قبوڵى ناكەم-، جا هەر كەسێك كردەوەيەك بكاو ، هاوبەشى بۆمن تێدا دابنێ، من لەو كەسە دوورم و، ئەو كردەوەيەش بۆ بكەرەكەيەتى و من قبوڵى ناكەم.

**لە سودەکانی فەرمودە:**

هەر کەسێك کردەوەیەك بکا بەپێش چاوی ، کردەوەکەی نادروستەو پێی گوناهبار دەبێت.

## الباب الرابع عشر: في محبة الله تعالى ، ومحبة رسوله ﷺ ، والحب في الله ، وشحّ المرءِ بدين الله الذي أكرمه به

## بابەتی چواردە: خۆشویستنی خودای پایەبەرز و، خۆشویستنی پێغەمبەرەکەی ﷺ و ، خۆشویستن لە پێناو خوداداو، ڕەزیلی مرۆڤ بە ئایینی خودا، کە پێی ڕێزدار کردووە

أخبرنا أبو علي الحسين بن محمد بن محمد بن علي الروزباري ، أنا أبو بكر محمد بن أحمد بن محمويه العسكري ، ثنا جعفر بن محمد القلانسي ، ثنا آدم بن أبي إياس ، ثنا شعبة ، ثنا قتادة ، عن أنس قال : قال رسول الله ﷺ : **" لا يجد أحدُكم حلاوةَ الإيمان، حتى يحب المرءَ لا يحبه إلا لله ، وحتى يكون أن يقذف في النار أحبُّ إليه من أن يرجع في الكفر بعد إذ أنقذه الله منه ، وحتى يكون اللهُ ورسولُه أحبَّ إليه مِمّا سواهما ".**

**واتای فەرمودە:**

هیچ یەکێکتان شیرینی بڕوای دەست ناکەوێ، تاوەکو ئەگەر کەسێکی خۆش دەوێ تەنها لەبەر خودا خۆشی بوێ و، تاوەکو پێیی خۆشتر دەبێ فڕەدانە ناو ئاگری دۆزەخەوە لەوەی کە بگەڕێتەوە بۆ بێ باوەڕی دوای ئەوەی خودا ڕزگاری کردو، تاوەکو خوداو پێغەمبەرەکەی لەلا خۆشەویستر دەبن لەهەمو شتێکی تر.

**لە سودەکانی فەرمودە:**

١- پێشەوا ( النووي) دەڵێ:" ئەمە فەرمودەیەکی گەورەیە، بنچینەیەکە لە بنچینەکانی ئیسلام". صحيح مسلم بشرح النووي،٢/ ١٣.

٢- پێشەوا ( ابن بطال ) دەڵێ: " خۆشەویستنی بەندە بۆ بەدیهێنەرەکەی( خودا) بریتیە لە پابەندبون بە گوێڕایەڵ کردنی و ، خۆدوورگرتن لەو شتانەی قەدەغەی کردووە، خۆشەویستنی پێغەمبەریش بەهەمان شێوەیە، کە بریتیە لە پابەندبون بەشەریعەتەکەی" . عمدة القاري، ١/ ١٤٨، ١٤٩.

٣- خۆشەویستنی یەکتری تەنها لەپێناو خودادا، چونکە موسڵمانان برای یەکترن، نەك لەپێناو مەبەستە دنیاییەکاندا.

٤- شیرینی بڕوا لەم سێ ڕەوشت و کردەوانەدایە، چونکە ئەم سێ شتانە ناونیشانی تیرۆتەسەلی بڕوان.

٥- بەدەستهێنانی کردەوە باشەکان و، خۆدوورگرتن و پاراستن لە کردەوە خراپەکان.

وبهذا الإسناد عن أنس قال : قال رسول الله ﷺ : **" لا يؤمن أحدُكم حتى أكون أحبَّ إليه من**

**ولده ووالده والناس أجمعين"**. رواهما البخاري في الصحيح عن آدم ورواهما مسلم عن أبي موسى وبندار عن غندر، عن شعبة.

**واتای فەرمودە:**

هیچ یەکێکتان بڕوای تەواو نابێت، تاوەکو من لەلای خۆشەویستر نەبم، لە منداڵی و باوك و دایكی و گشت خەڵكی.

**لە سودەکانی فەرمودە:**

١- پێشەوا ( النووي) دەڵێ : " هەر کەسێك بڕوای تەواو کردبێ، دەزانێ کە مافی پێغەمبەر لەسەر ئەو لەپێشترە لە مافی باوکی و منداڵی و گشت خەڵکی ، چونکە بەهۆی پێغەمبەر لە ئاگری دۆزەخ رزگارکراوین و لە گومرایی هیدایەت دراوین". صحيح مسلم بشرح النووي، ٢/ ١٦.

٢- زانا ( القاضي عياض ) دەڵێ:" لە خۆشەویستنی پێغەمبەرە سەرخستنی سوننەتەکەی و بەرگریکردن لە شەریعەتەکەی" . صحيح مسلم بشرح النووي، ٢/ ١٦.

أخبرنا أبو طاهر الفقيه ، ثنا حاجب بن أحمد ، ثنا أبو عبد الرحمن المروزي ، ثنا ابن المبارك ، عن عبيد الله بن عمر ، عن خبيب بن عبد الرحمن ، عن حفص بن عاصم بن عمر ، عن أبي هريرة ﷺ ، أن رسول الله ﷺ قال : **" سبعةٌ يظلهم الله تعالى في ظله يومَ القيامة، يوم لا ظل إلا ظله، إمامٌ عادل ، وشابٌّ نشأ في عبادة الله عز وجل ، ورجل ذكر الله تعالى في خلاءٍ ففاضت عيناه ، ورجل كان قلبُه معلّقا في المسجد ، ورجلان تحابّا في الله عز وجل ، ورجل دعته امرأةٌ ذاتُ منصبٍ وجمالٍ إلى نفسها فقال : إني أخاف الله تعالى ، ورجل تصدق بصدقة، فأخفاها حتى لم تعلمْ شمالُه ما صنعتْ يمينُه "**. أخبرنا أبو عبد الله الحافظ ، أنا أبو محمد الحسن بن محمد بن حليم ، بمرو، أنا أبو الموجه ، أنا عبدان ، أنا عبد الله بن المبارك ، أنا عبيد الله بن عمر ، فذكر بإسناده مثله سواءً . رواه البخاري عن محمد بن سلام عن عبد الله وأخرجاه من حديث يحيى القطان عن عبيد الله ، في حديثه : " ورجلان تحابا في الله ، اجتمعا عليه وتفرقا عليه ".

**واتای فەرمودە:**

حەوت کەس لە دوارۆژدا لەژێر سێبەری خودای پایەبەرزدا دەبن، کاتێ هیچ سێبەرێك نیە تەنها سێبەری عەرشی ئەو نەبێت، پێشەوای دادوەر، گەنجێك کە لەناو پەرستشی خودای پایەبەرزدا پێگەیشتبێ، پیاوێکیش بەتەنیا زیکری خودای کردبێ و چاوەکانی فرمێسکیان ڕشتبێ، پیاوێکیش دڵەکەی پەیوەست بوبێ بەمزگەوتەوە، دوو پیاویش لە پێناو خودای پایەبەرزدا یەکتریان خۆش ویستبێ، پیاوێکیش ئافرەتێکی خاوەن پایەو جوانی بانگی بکات بۆ کاری خراپەو پیاوەکە بڵێ: من لەخودای مەزن دەترسم، پیاوێکیش خێرێکی کردبێ و خێرەکەی شاردبێتەوە بەجۆرێك کە دەستی چەپەی نەزانێ دەستە ڕاستەکەی چی بەخشیوە.

**له سودەکانی فەرمودە:**

١- ئەم فەرمودەیە ڕەگەزی نێر و مێ دەگرێتەوە.

٢- گەورەیی پێشەوای دادوەر.

٣- هەستیاری تەمەنی گەنجێتی لە ئیسلامدا.

٤- گەورەیی مزگەوت و پەیامەکەی لە ژیانی موسڵماندا.

٥- گەورەیی ئەو کەسەی خۆی لە گوناه و تاوان پاراستووە و بەدرێژایی تەمەنی خەریکی پەرستنی خودا بوە.

٦- گەورەیی خۆشویستن لە پێناو خودادا، نەك بۆ مەبەستێکی دنیایی .

٧- گەورەیی ئەو کەسەی لەخودا دەترسێ و دەزانێ خودا ئەو دەبینێ.

٨- گەورەیی خێرکردن بەپەنهانی، بەتایبەتی ئەگەر خێرکردنی سوننەت بو.

٩- گەورەیی زیکرکردنی خوداو گریان لە ترسی ئەودا.

## الباب الخامس عشر: في المواظبة على ذكر الله عز وجل، وتلاوة كتابه

## بابەتی پازدە: بەردەوام بون لەسەر زیکری خودای پایەبەرزو، خوێندنەوەی قورئانەکەی

أخبرنا أبو الحسين علي بن محمد بن عبد الله بن بشران المعدل ببغداد أنا أبو جعفر محمد بن عمرو الرزاز، ثنا أحمد بن عبد الجبار، ثنا أبو معاوية، عن الأعمش، عن أبي صالح، عن أبي هريرة ﷺ قال: قال رسول الله ﷺ: " **يقول الله عز وجل: أنا عند ظن عبدي بي، وأنا معه حين يَذكُرني، فإن ذكرني في نفسه ذكرته في نفسي، وإن ذكرني في ملأ ذكرته في ملأ خير منهم، وإن اقترب إلي شبرا اقتربت إليه ذراعا، وإن اقترب إلي ذراعا اقتربت إليه باعا ، وإن أتاني يمشي أتيته هَرْوَلةً** ". رواه مسلم، عن أبي بكر بن أبي شيبة وأبي كريب عن أبي معاوية وأخرجه البخاري من وجه آخر عن الأعمش. وهذا مثل ضربه لسرعة إجابة الله لعبده وقبوله لعبادته .

وفيما أخبرنا أبو نصر عمر بن عبد العزيز بن قتادة قال: وفيما أملى علينا الإمام أبو سهل محمد بن سليمان في معنى هذا الحديث قال: " يقرب العبد بالإحسان، ويقرب الحق بالامتنان - يريد أنه الذي أدناه - ويقرب العبد إليه بالتوبة والإنابة، ويقرب الباري إليه بالرحمة والمغفرة، ويقرب العبد إليه بالسؤال، ويقرب إليه بالنوال، ويقرب العبد إليه بالسرِّ، ويقرب إليه بالبشر، قال: وقيل في معناه: إذا تقرب إلي العبد بما تعبَّدتُه، قرّبْتُ إليه ما له عليه وعدتُه " .

**واتای فەرمودە:**

خودای مەزن دەفەرمێ: بەندەم ئومێدو هیوای بەمن چییە، منیش وادەبم لەگەڵیدا، من لەگەڵیدادەبم کاتێ زیکرم دەکا بەڕەحمەت و لێخۆشبوونی خۆم، ئەگەر زیکری منی کرد من پاداشتی دەدەمەوە، ئەگەر باسی منی کرد لەلای کۆمەڵە خەڵکێك من باسی دەکەم لەناو

فریشتەکانی باشتر لەواندا، ئەگەر لەمن نزیك بووە بەئەندازەی بستێك مـن بەئەنـدازەی گـەزێك لێـی نزیك دەبمەوە، ئەگەر بەئەندازەی گەزێك لەمن نزیك بووە من بەئەندازەی باڵێك لێی نزیك دەبمەوە، ئەگەر بەپیادە بێتە لام من بە گۆرگەلۆقە دەچمە لای .

**لە سودەکانی فەرمودە:**

١- پەسەندکردنی لای ئومێدو هیوا بەسەر لای ترساندا.

٢- گەورەیی ڕەحمەتی خودا.

٣- بێ ئومێدنەبون لە ڕەحمەتی خودا بەزۆر گوناه کردن.

٤- هاندان بۆ زیاتر پەرستنی خوداو نێزیك بونەوە لەو بەکردەوەی باش .

٥- " ئەم فەرمودەیە هـەویرکراوێکی ئاوێتـەی سودبەخشـە بـۆ نەخۆشـیەکانی دڵانێـك کـە ڕێگـەی خـودای گرتـوەو، بزوێنـەری تامـەزرۆی داواکارانـەو، بـەهێزکاری سـینگی گوناهبارانـە" مرقـاة المفاتیح، ٥/ ١٤٢.

أخبرنا أبو الحسين محمد بن الحسين بن محمد بن الفضل القطان ، ببغداد، أنا عبد الله بن جعفر النحوي ، ثنا يعقوب بن سفيان ، ثنا أبو صـالح ، حـدثني معاويـة بـن صـالح ، عـن عمـرو بـن قـيس الكندي ، عن عبد الله بن بسر قال : جـاء أعرابيـان إلى رسـول الله ﷺ يسـألانه ، فقـال أحـدهما : يـا رسول الله ، أي الناس خير ؟ قال : **" من طال عمرُه ، وحسُن عمله "**. وقال الآخر : يا رسـول الله ! إن شرائع الإسلام قد كثُرت علي ، فأخبرني بأمر أتشبَّثُ به ، قال : **" لا يزال لسـانُك رطْبـاً بـذكر الله عز وجل "**.

**واتای فەرمودە:**

دوو دەشتەکی هاتنـە لای پێغەمبـەری خـودا ﷺ پرسـیاری لێ بکـەن، یـەکێکیان گـوتی: ئـەی پێغەمبەری خودا! کامە کەس لە خەڵکی بارودۆخی باشترە؟ فەرمویﷺ: ئەو کەسەی تەمەنی درێژ بووەو، کردەوەی باش بوە. ئەوەی تریان وتی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا! ئەحکامـەکانی شـەریعەتی ئیسلام لەسەر من زۆربوون، کارێکم نیشـان بـدە کەدەسـتی پێـوەبگرم ، فـەرموی ﷺ: بـا هەمیشـە زبانت تەڕ بێت بەزیکری خودای پایەبەرز.

**لە سودەکانی فەرمودە:**

١- گەورەیی کـردەوەی بـاش و، پێویسـتە موسـڵمان تەمـەنی بەفرسـەت بزانـێ و، لـە چاکە سەرفی بکات.

٢- گەورەیی زیکری خوداو، هەمیشە موسڵمان زبانی لەسەر زیکـری خـودا بـێ، لـە مـاڵ و لـە دەرەوەدا، لە نیشتەجێبون و لە گەشتدا، لە وەستان و دانیشتندا، لە هاتوچۆدا...

أخبرنا أبو عبد الله الحافظ ، ثنا أبـو العبـاس محمـد بـن يعقـوب ، ثنـا أحمـد بـن عبـد الحميـد

الحارثي ، ثنا أبو أسامة ، عن بريد ، عن أبي بردة ، عن أبي موسى ، عن النبي ﷺ قال : **" تعاهدوا القرآن ، فوالذي نفس محمد بيده ، لهو أشدُّ تفلّتاً من الإبل في عُقُلِها "**. رواه البخاري ومسلم عن أبي كريب عن أبي أسامة.

**واتای فەرمودە:**

- پارێزگاری لەم قورئانە بکەن، بەخوێندنەوەی و کارپێکردنی، سوێند بەو خوایەی گیانی موحەممەدی بەدەستە، ئەو قورئانە بەهێزتر لە سینگی مرۆڤ دەردەچێ ، لە دەرچونی ووشتر لە گوریسەکەیدا.

**لە سودەکانی فەرمودە:**

١- بەردەوام خوێندنەوەی قورئان، بۆ ئەوەی لەبیرنەکرێ.

٢- کارکردن بە قورئان.

٣- قورئان زۆر هەستیارە، ئەگەر بەرێك و پێکی پارێزگاری لەسەر نەکەی، لەدەستت دەردەچێ و ڕادەکات.

## الباب السادس عشر : في الشكر على السراء ، والصبر على الضراء

## بابەتی شازدە : سوپاسکردن لەسەر خۆشی و، ئارامگرتن لەسەر ناخۆشی

أخبرنا أبو عثمان سعيد بن محمد بن محمد بن عبدان النيسابوري ، ثنا أبو عبد الله محمد بن يعقوب الحافظ ، ثنا السري بن خزيمة ، ثنا موسى بن إسماعيل ، ثنا سليمان بن المغيرة ، ثنا ثابت ، عن ابن أبي ليلى ، عن صهيب قال : قال رسول الله ﷺ : **" عجباً لأمر المؤمن ، إن أمر المؤمن كلّه له خير ، إن أصابته سَرّاء فشكر كان خيرا ، وإن أصابته ضرّاءُ فصبر كان خيرا "**. رواه مسلم في الصحيح عن هدبة وشيبان بن فروخ عن سليمان بن المغيرة.

**واتای فەرمودە:**

من سەرم سورماوە لە بارودۆخی بڕوادار، گشت کارەکانی بۆ ئەو باشن لە دەرئەنجامدا، ئەگەر خۆشیەکی پێگەیشت و سوپاسی خودای کرد لەسەر خۆشیەکە ، ئەمە دەبێتە خێر بۆ ئەو، ئەگەریش ناخۆشیەکی پێگەیشت و ئارامی لەسەر گرت دەبێتە خێر بۆ ئەو.

**لە سودەکانی فەرمودە:**

١- موسڵمان سوپاس و ستایشی خودا دەکات، لەسەر ئەو نیعمەت و خۆشیانەی پێیداون.

٢- موسڵمان ئارام دەگرێ لەسەر ئەو ناخۆشی و کارەساتەی توشی دەبن لەم دنیایەدا.

أخبرنا أبو محمد عبد الرحمن بن محمد بن أحمد بن بالويه المزكي ، وأبو عثمان سعيد بن محمد بن محمد بن عبدان قالا : أنا أبو بكر محمد بن المؤمل بن الحسن بن عيسى ، ثنا الفضل بن محمد البيهقي ، ثنا عبد الله بن صالح ، حدثني معاوية بن صالح ، عن أبي حلبس يزيد بن ميسرة ، أنه قال

: سمعت أم الدرداء ، تقول : سمعت أبا الدرداء يقول : سمعت أبا القاسم ﷺ ما سمعته يكنيه قبلها ولا بعدها ، يقول : **" إن الله عز وجل قال : يا عيسىَ ابنَ مريم " إني باعثٌ بعدك أمةً، إن أصابهم ما يحبون حمَدوا وشكَروا ، وإن أصابهم ما يكرهون احتَسَبوا وصَبَروا ، ولا حِلم ولا عِلم . قال : يا رب كيف يكون هذا لهم ولا حِلم ولا عِلم ؟ قال : أعطيهم من حلمي وعلمي".**

**واتای فەرموده:**

خودای پایەبەرز دەفەرمێ: ئەی عیسای کوڕی مەریەم، من دوای تۆ ئوممەتێك دروست دەکەم- مەبەست باشەکانی ئوممەتی موحەممەدە- ، ئەگەر شتێکیان پێگەیشت کە مایەی خۆشیان بو، سوپاس و ستایشی لەسەر دەکەن، ئەگەریش شتێکیان پێگەیشت کە مایەی ناخۆشیان بو، داوای پاداشت لەخودا دەکەن و ئارام دەگرن، کەچی ئەوان هیچ سیفەتی نەرم و نیانی و زانینی تێروتەسلیان نیە . عیسا فەرموی: ئەی پەروەردگارم! چۆن ئەمە بارودۆخیانە، کەچی هیچ نەرم ونیانی و زانینی تێرۆتەسلیشیان نیە، - کە هەردوکیان ئامرازی ئەو ڕەوشتانەن کە باست کردن - . خودا فەرموی: لە نەرم و نیانی و زانستی لای خۆم پێیان دەبەخشم.

**لە سودەکانی فەرموده:**

ئەم فەرمودەیە جەخت لەسەر فەرمودەکەی پێشووتر دەکاتەوە، کە موسڵمان سوپاسی خودا دەکا لەسەر خۆشیەکان و، ئارام دەگرێ لەسەر ناخۆشیەکان.

## الباب السابع عشر: في الرضا بالقضاء
## بابەتی حەڤدە: ڕازیبوون بەقەزاوقەدەر

روينا في حديث عبد الله بن عمرو عن النبي ﷺ أنه قال في دعائه : **" أسألك الرضا بعد القضاء".**

**واتای فەرموده:**

پێغەمبەری خودا ﷺ لە پاڕانەوەکانیدا دەیفەرموو: من داوات لێدەکەم دوای قەزاوقەدەرت، ڕازیبوونم پێ ببەخشی.

**لە سودەکانی فەرموده:**

دەبێت موسڵمان ڕازیبێت بە قەزاو قەدەری خوداو، هەمیشە داوا لە خودا بکات یارمەتی بدات بۆ ئەم مەبەستەو، گرتنەبەری هۆکارەکان دژ نیيە لەگەڵ قەزاوقەدەر.

أخبرنا أبو عبد الله الحافظ ، أخبرني أبو النضر الفقيه ، ثنا الحارث بن أبي أسامة ، ثنا المعلى بن منصور ، ثنا عبد العزيز بن محمد ، ح وأخبرنا أبو عبد الله ، ثنا أبو منصور محمد بن القاسم العتكي ، ثنا محمد بن إدريس الشافعي المطلبي ، أنا عبد العزيز بن محمد الدراوردي ، عن ابن الهاد ، عن محمد بن إبراهيم ، عن عامر بن سعد ، عن العباس بن عبد المطلب ، أنه سمع رسول الله ﷺ

يقول : " ذاقَ طعم الإيمان، من رضي بالله ربّاً ، وبالإسلام دينا ، وبمحمد نبيا ". رواه مسلم في الصحيح عن ابن أبي عمر وبشر بن الحكم عن عبد العزيز الدراوردي.

**واتای فەرموده:**

تامی بڕوای چێشتووە، ئەو کەسەی ڕازیبووە، کە ( الله ) خودای ئەو بێ و، ئیسلام ئایینەکەی بێ و ، موحەممەدیش ﷺ پێغەمبەرەکەی بێ.

**لە سودەکانی فەرموده:**

ڕازیبوون بە قەزەوا وقەدەری خودا، پایەیەکە لە پایەکانی بڕواو، بەشێکە لە بڕوابوون بەخودای مەزن.

وروی سفيان الثوري ، عن منصور بن المعتمر ، عن خيثمة ، عن ابن مسعود ، عن النبي ﷺ أنه قال : **" لا تُرضِيَنَّ أحدا بسخطِ الله ، ولا تحمَدَنَّ أحدا على فضلِ الله ، ولا تذُمّنَّ أحدا على ما لم يُرِدِ الله ، فإن رزقَ الله لا يسوقه إليك حرصُ حريصٍ ، ولا يرُدُّه عنكَ كُرهُ كارِهٍ ، وإن الله تعالى بقِسطه وعدله، جعل الرَّوحَ والرّاحة والفرج في الرضا واليقين ، وجعل الهمّ والحزن في الشك والسخط".**

**واتای فەرموده:**

هیچ کەسێك ڕازی مەکە بە تووڕەکردنی خودا، سوپاسی هیچ کەسێکیش مەکە لەسەر نیعمەتەکانی خودا، لۆمەی هیچ یەکێکیش مەکە لەسەر شتێك کە خودا نەیویستوە ببێت، چونکە بە کۆششی کۆششکارێك ڕزقی خودات بۆناهێ و، بە پێناخۆشبونی پێناخۆشێکیش ڕزقی خودا لەتۆ ناگەڕێتەوە – ئەوەی بۆت داندراوە پێتدەگات – ، خودای مەزن بە دادپەروەریەکەی، ئاسوودەیی و هێمنی و کەیفخۆشی لە ڕازیبوون بەقەزا و دڵنیاییدا داناوەو، غەم و دڵتەنگیشی لە گومان و ڕازی نەبون بەقەزاو قەدەردا داناوە.

**لە سودەکانی فەرموده:**

١– نابێ کارێك بکەی ، خەڵك لەخۆت ڕازی بکەی و، خودای مەزن لەخۆت تووڕە بکەی، بەڵکو ئەگەر خودا لێت ڕازیبوو، با هەموو خەڵك لێت ناڕازی بن.

٢– گەورەیی بڕوابوون بەقەزاو قەدەر ، چونکە بەختەوەری و دڵنیایی بە مرۆڤ دەبەخشێت لەم دنیایەدا.

٣– ڕازی نەبوون بە قەزاو قەدەری خودا دەبێتە مایەی دڵتەنگی و غەمگینی و نەخۆشی دەروونی لەلای ئەو کەسە.

أخبرنا الحاكم أبو عبد الله الحافظ ، ثنا محمد بن صالح بن هانئ ، ثنا جعفر بن شعيب الشاشي، ثنا أبو حمة ، ثنا أبو قرة ، عن سفيان بن سعيد ، فذكره هكذا . روي بهذا الإسناد .

وخالفه خالد بن يزيد العمري فرواه عن الثوري ، وغيره عن الأعمش ، عن خيثمة ، عن عبد الله، عن النبي ﷺ .

أخبرنا القاضي الإمام أبو عمر محمد بن الحسين بن محمد ، ثنا أبو بكر أحمد بن محمود بن خرزاذ الأهوازي بها ، ثنا أحمد بن أيوب ، ثنا خالد بن يزيد العمري ، ثنا سفيان الثوري ، وشريك بن عبد الله ، وسفيان بن عيينة ، عن سليمان الأعمش ، عن خيثمة ، فذكره غير أنه قال : " ولا تذمن أحدا على ما لم يؤتك الله ". ولم يذكر كلمة الراحة ، هكذا رواه خالد العمري عنهم . وإنما رواه الثقات عن سفيان بن عيينة ، عن أبي هارون المدني قال : قال ابن مسعود : " اليقين أن لا تُرضيَ الناسَ بسخط الله " فذكره موقوفا مرسلا . أخبرناه أبو الحسين بن بشران ، ثنا الحسين بن صفوان ، ثنا ابن أبي الدنيا ، ثنا الحسن بن الصباح ، ثنا سفيان ، فذكره.

## الباب الثامن عشر : في الكسب من الحلال صيانة عن السؤال

## بابەتی هەژدە: کارکردنی حەلال پارێزەرە لە دەرۆزە

أخبرنا أبو محمد عبد الله بن يوسف الأصبهاني ، أنا أبو سعيد بن الأعرابي ، ثنا الحسن بن محمد الزعفراني ، ثنا وكيع بن الجراح ، عن هشام بن عروة ، عن أبيه ، عن جده قال : قال رسول الله ﷺ : " **لأن يأخُذ أحدُكم حبله، فيأتي الجبلَ، فيجيءَ بحُزمة من حطب على ظهره فيبيعها ، فيستغني بها ، خير له من أن يسأل الناس ، أعطوه أو منعوه** ". رواه البخاري في الصحيح عن يحيى بن موسى عن وكيع، وأخرجه مسلم من حديث أبي هريرة عن النبي ﷺ ، وفيه من الزيادة : " فيتصدق به ويستغني به عن الناس ".

**واتای فەرموده:**

ئەگەر یەکێکتان گوریسەکەی هەڵبگرێ و، بچێتە سەر چیا، جا کۆمەڵە دارێك بهێنێ بەلەسەر پشتی و، بیفرۆشێت، بۆ ئەوەی پێویستی بەخەڵك نەبێ، باشترە بۆ ئەو لەوەی کە داوا لە خەڵکی بکا، جا ئەوانیش ئاخۆ دەیدەنێ یان نایدەنێ.

لە گێردراوەیەکدا: خێری پێبکاو، پێویستی بەخەڵکی نەبێت.

**لە سودەکانی فەرموده:**

١- هاندان بۆ کارکردن بەدەستی خۆت.

٢- هاندان بۆ وەدەستهێنانی ماڵی حەلال.

٣- ناپەسەندە داواکردنی مال لە خەڵکی بەبێ پێویستی.

٤- کار یەکێکە لە هۆکارەکانی وەبەرهێنان لە ئابووری ئیسلامیدا.

أخبرنا أبو عمرو محمد بن عبد الله الأديب ، أنا أبو بكر الإسماعيلي ، أنا أبو يحيى الروياني ، ثنا إبراهيم هو ابن موسى الفراء ، ثنا عيسى بن يونس ، ثنا ثور ، عن خالد بن معدان ، عن المقدام بن معدي كرب أن رسول الله ﷺ قال : " **ما أكل أحدٌ من بني آدم طعاما خيرا له من أن يأكل من**

عمل يده ، إن نبي الله داود عليه السلام كان يأكل من كسب يده ". رواه البخاري عن إبراهيم بن موسى.

**واتای فەرمودە:**

هیچ یەکێك لە ئادەمیزاد خواردنێکی نەخواردوە کە بۆ ئەو باشتر بێ لەوەی کە لەنانی دەستی خۆی بخوا، پێغەمبەری خودا داود – سەلامی خودای لەسەر بێ – لە نانی دەستی خۆی دەخوارد.

**لەسودەکانی فەرمودە:**

١– هاندان بۆ وەدەستهێنانی ماڵی حەلال.

٢– ئەگەر مرۆڤ کاری کرد و خۆی خەریك کرد بە ئیشێك، دوور دەبێت لە بێ ئیش و سستی وکاری خراپ و تاوانکاری.

٣– بە ئیشکردن دەروون دەشکێت و هەلگافتنی و فیز لێدانی کەم دەبێتەوە.

٤– بە ئیشکردن چاوی لەدەستی کەسانی تر نابێت.

٥– کارکردن و ئیشکردن لە سوننەتەکانی پێغەمبەرانە ( علیهم السلام ) .

٦– ئیشکردن و کارکردن ئامرازی سەرکی پەرەسەندنن لە دیدی ئابووری ئیسلامداو، کار بە یەکێك لە ئامرازەکانی وەبەرهێنان دادەنێت.

٧– بەکارکردن سود بەخۆت و کەسی تریش دەگەیەنی.

٨– بۆیە بەتایبەتی باسی داودی کرد ( علیه السلام )، چونکە کارکردنی ( داود ) لەبەر پێویستی نەبو، چونکە خەلیفەی خودابو لەسەر زەوی، بەڵکو داود ویستی لەرێگەی باشترەوە نان پەیدا بکات، کە کارکردنە.

## الباب التاسع عشر: في الاكتفاء بما فيه أقل الكفاية، والقناعة بما آتاه الله تعالى

**بابەتی نۆزدە: بەس بوون بەلای کەمی بەشکردن و، قەناعەت بوون بەوەی خودای مەزن پێیداوە**

أخبرنا أبو أحمد عبد الله بن محمد بن الحسن المهرجاني ، وأبو زكريا بن أبي إسحاق قالا : ثنا أبو عبد الله محمد بن يعقوب ، ثنا خشنام بن الصديق ، ثنا عبد الله بن يزيد المقري ، ثنا سعيد بن أبي أيوب ، ثنا شرحبيل بن شريك ، عن أبي عبد الرحمن الحبلي ، عن عبد الله بن عمرو بن العاص ، أن رسول الله ﷺ قال : **" قد أفلح من أسلَمَ ، ورُزِق كفافاً ، وقنَّعه اللهُ بما آتاه "**. رواه مسلم في الصحيح عن أبي بكر بن أبي شيبة عن عبد الله بن يزيد المقري.

**واتای فەرمودە:**

سەرکەوتو بوە ئەو کەسەی گوێرایەڵی خودای کردوەو،ئەوەندە ڕزقێکی حەلالی پێدراوە کە لە دنیادا تەنها پێداویستیەکانی دابین بکاو ، خودا قەناعەتی پێداوە لەسەر ئەو بەشەماڵەی پێیداوە.

**لە سودەکانی فەرمودە:**

١- زۆر خۆ نەبەستنەوە بە دنیاو سووربون لەسەر پەیداکردنی تەنها بژێوی ڕۆژانە.

٢- گەورەیی قەناعەت و کەفاف( بەشی ژیانت هەبێ، بەبێ کەمی و زۆری).

أخبرنا أبو الحسين علي بن محمد بن عبد الله بن بشران ، ببغداد ثنا إسماعيل بن محمد الصفار ، ثنا سليمان بن الأشعث قال : ثنا عبد الله بن عبد الجبار الخبايري ، ثنا عبد الله بن حميد المزني ، عن أبيه ، عن معاوية بن حيدة قال : أتيت رسول الله ﷺ فقلت : يا رسول الله ، ما يكفيني من الدنيا ؟ قال : **" ما سدَّ جَوعَتك ، وستَرَ عَورتَك ، فإن كان بيتٌ فذلك ، وإن كان حمار فبخٍ بخٍ ، فَلَقٌ من خُبزٍ ، وجُرْعةٌ من ماء ، وأنت مسئولٌ عما فوق الإزار "**. وروي هذا المتن من وجه آخر عن ثوبان مرفوعا ، ومن وجه آخر عن أبي الدرداء مرفوعا ، ومن وجه آخر عن أبي أمامة مرفوعا ، وإذا انضمت هذه الأسانيد بعضها إلى بعض أخذت قوة.

**واتای فەرمودە:**

موعاویە هاتە لای پێغەمبەری خوداﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! چ لەم دنیایە بەسی منە؟ فەرمویﷺ : ئەوەندەی کە برسیایەتیت لاببا، دامێنت دابپۆشێ ، ئەگەر خانوێکیش هەبو باشە، ئەگەریش کەرێکیش هەبو باشە، پارچە نانێك و ، قومە ئاوێك، تۆ بەرپرسی لە پۆشاکی زیاتر لە پەشتەماڵ.

**لە سودەکانی فەرمودە:**

١- گەورەیی قەناعەت لە ئیسلامدا و کاریگەریی بەسەر بەختەوەری مرۆڤەوە لەم دنیایەدا.

٢- زیادەڕۆیی نەکردن لە خواردنداو بوونی پۆشاکدا.

٣- بوونی خانووێك و ئۆتومبیلێك پێچەوانەی هەبوونی قەناعەت نییە.

وروى مروان بن معاوية ، عن عبد الرحمن بن أبي شميلة ، عن سلمة بن عبيد الله بن محصن ، عن أبيه قال : قال رسول الله ﷺ : **" من أصبح منكم آمنا في سِرْبِه ، معافىً في جسده ، وعنده قوت يومه ، فكأنما حِيزت له الدنيا "**.حدثناه أبو عبد الرحمن السلمي إملاء ، ثنا أبو بكر أحمد بن إسحاق الفقيه ثنا العباس بن الفضل الأسفاطي ، ثنا سريج بن يونس ، ثنا مروان بن معاوية فذكره ، غير أنه قال : عن عبد الرحمن ، عن أبيه ، وأبوه فيه زيادة فيما أعلم . وروي هذا المتن عن ابن عمر ، مرفوعا غير أنه قال : **" فعلى الدنيا العفاء "**.

**واتای فەرمودە:**

ئەگەر هەر یەکێکتان لەخۆی و ماڵ ومنداڵ و خزمەکانیدا ئەمین بو– واتە ئاسایش هەبو – و، لەشی ساغ بو لە نەخۆشیەکانی ئاشکراو نادیار، ڕزقی حەلالی ڕۆژی هەبو ، وەك ئەوەیە کە هەمو دنیای بۆ کۆکرابێتەوە – واتە دنیا هەمووی هی ئەو بێت –.

لە گێردراوەیەکدا: با دنیا لەناو بچێت – بەمانا ئەگەر ئەو سێ شتانەی سەرەوەت هەبوون، خۆت خەریك مەکە بەشتی ترو، خەریکی ئەو کردەوانە بە کە نزیکت دەکەنەوە لە خودا –.

**لە سودەکانی فەرمودە:**

١– ئاسایش و نەبوونی ترس یەکێکە لە نیعمەتەکانی خودا، چونکە بەبێ ئاسایش مرۆڤ ناتوانێ کارەکانی ئایینی و دنیایی ئەنجام بدات.

٢– بایەخدانی ئیسلام بە تەندروستی و ، لەش ساغی مرۆڤ یەکێکە لە نیعمەتەکانی خوداو، گەرەکە مرۆڤ پارێزگاری لەسەر بکاو، سوپاسی خودای لەسەر بکاو بەفرستی بزانێ بۆ کردنی کاری باش.

٣– ئەگەر مرۆڤ ڕزقی حەلالی ڕۆژی هەبو، ئەوا نیعمەتێکە لە نیعمەتەکانی خوداو، شایەنی سوپاس لەسەرکردنە، بە گوێڕایەڵیکردنی فەرمانەکانی خوداو دوورکەوتنەوە لە قەدەغەکراوەکانی.

٤– هۆشمەندان دەڵێن: سێ شت کۆتاییان نیە: ئاسایش ، تەندروستی، بەس بوون ( الكفاية). التفسير الكبير للفخر الرازي، ٢٠/ ١٣٠.

## الباب العشرون : في التوكل على الله تعالى
## بابەتی بیست : پشت بەستن به خودای مەزن

أخبرنا أبو عبد الله الحافظ ، ثنا أبو عبد الله محمد بن عبد الله بن أحمد الصفار الأصبهاني، إملاءً ، ثنا أبو يحيى أحمد بن عصام بن عبد المجيد الأصبهاني ، ثنا روح بن عبادة ، ثنا شعبة قال : سمعت حصين بن عبد الرحمن ، عن سعيد بن جبير ، عن ابن عباس ، أن رسول الله ﷺ قال : " **يدخل الجنة من أمتي سبعون ألفا بغير حساب " قال : فقلت : من هم ؟ قال : " هم الذين لا يسْتَرقُون ، ولا يَتطيَّرون ، ولا يعْتافون ، وعلى ربهم يتوكلون** ". رواه البخاري عن إسحاق عن روح، ورواه مسلم عن أبي بكر عبد الله بن محمد بن أبي شيبة عن محمد بن فضيل عن حصين فذكره ، غير أنه لم يذكر قول : " ولا يعتافون ". وزاد وقال عكاشة بن محصن : أنا منهم يا رسول الله ؟ فقال : " أنت منهم ". ثم قام رجل آخر فقال : أنا منهم ؟ فقال : " قد سبقك بها عكاشة ". أخبرنا محمد بن عبد الله الحافظ ، أنا أبو جعفر بن دحيم ، ثنا أحمد بن حازم الغفاري ، ثنا عبد الله بن محمد بن أبي شيبة ، فذكره.

قال الشيخ الإمام أحمد رحمه الله تعالى : التوكل طمأنينة القلب، وسكونه إلى موعود الله تعالى ،

وذلك لا يمنع الكسب من الحلال ، فيكتسب بظاهر العمل ، معتمدا بقلبه على الله تعالى لا على كسبه ، لعلمه بأن لا حول ولا قوة إلا بالله، وكذا قال أبو الحسن علي بن أحمد البوشنجي فيما أخبرنا أبو عبد الله الحافظ ، عنه : التوكل التبرئة من حولك وقوتك ، وحول مثلك وقوة مثلك.

**واتای فەرمودە:**

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموی: لە ئوممەتی مـن حـەفتا هـەزار –كۆمەڵـە – بـەبێ لێپرسـینەوە دەچنە بەهەشت. عەبدوللای کوڕی عەبباس وتی: ئەوان کێن؟ فەرموی: ئەوانەی داوای چارەسـەری ناکەن بەڕەها یان بەبێ وشەکانی قورئـان و ناوەکـانی خـودا، ئەوانـەی بـەدبینی ناکـەن بـە وێنـەی باڵندە و، ئەوانەی کە پێیان ناخۆش نیە ئەوەی لەلایەن خوداوە بۆیان تەقدیر کراوەو، لـە کـردن و نەکردنی هەمو کارێکیشدا تەنها پشت بەخودا دەبەستن.

**لە سودەکانی فەرمودە:**

١– گەورەیی پشت بەستن بـەخوداو، گرتنـە بـەری هۆکارەکـان دژ نیـە لەگـەڵ پشـت بەسـتن بەخودا.

٢– تەنها ئەو چارەسەریە (رقيّة) دروستە، کە لە قورئان و فەرمودەی دروسـتـەوە هـەڵقوڵاوەو ڕێی پێدراوە.

٣– بەدبینی دروست نیە.

٤– ڕازیبون بە قەدەری خودا.

## الباب الحادي والعشرون : فيمن توسع في اكتساب المال الحلال فوق الكفاية ، إن استفاده من وجه حلال ، وأخرج منه حق الله تعالى فيه ، واستغنى هو وعياله بباقيه

### بابەتی بیست و یەك: ئەو کەسەی فراوانی دەکا لە وەدەستهێنانی ماڵی حەلال زیاتر لە بەس بوون ، ئەگەر لە ڕێگەیەکی حەلالەوە پەیدای کردو، مافی خودای مەزنی تێدا دەرکردو، ئەوەیشی ماوە بۆ خۆی ومنداڵەکانی بو.

أخبرنا أبو الحسين بن بشران ، أنا أبو الحسن علي بن محمد المصري ، ثنا عبيد الله بـن محمـد العمري ، ح وأخبرنا علي بن أحمد بن عبدان ، أنا أحمد بن عبيد الصفار ، ثنا إسماعيـل بـن إسـحاق القاضي قالا : ثنا إسماعيل بن أبي أويس ، ثنا مالك ، عن زيد بن أسلم ، عن عطـاء بـن يسـار ، عـن أبي سعيد الخدري ، أنه قال : قال رسول الله ﷺ : **" إن أكثر ما أخاف عليكم ما يُخرِج الله لكـم مـن بركات الأرض " فقيل : ما بركات الأرض ؟ قال : " زَهرة الدنيا " فقال له رجل : هـل يـأتي الخير بالشر ؟ فصمت رسول الله ﷺ حتى ظننا أنه ينزل عليه ، ثم جعل يمسح العَرق عن جبينه وقال : " أين السائل : هل يأتي الخيرُ بالشر ؟ " قال الرجل : أنا ذا ، قال أبو سعيد : لقد حمِدناه حين صنع ذلك ، قال : فقال رسول الله ﷺ : " إن الخير لا يأتي إلا بالخير – ثـلاث مـرات – ولكـن هـذا المـال**

**خُضرة حُلوة ، إن كل ما يُنبِت الربيعَ يَقتُل حَبَطاً أو يُلِمُّ، إلا آكِلة الخضرة، أكلت، حتى إذا امتدت خاصِرتاها، استقبلتِ الشمسَ ، فاجتَّرتْ وثلّطتْ، وبالت ، ثم عادت فأكلت ، إن هذا المال خضرة حلوة ، من أخذه بحقه، ووضعه في حقه، فنعمَ المعونة هو ، ومن أخذه بغير حقه، كان كالذي يأكل ولا يَشبع ".** رواه البخاري عن ابن أبي أويس ، ورواه مسلم عن أبي الطاهر عن ابن وهب عن مالك.

**واتای فەرمودە:**

پێغەمبەری خوداﷺ فەرموی: زۆرترین شت کە دەربارەی لێتان بترسم ئەوەیە کە خودا لە بەرەکەتەکانی زەوی بۆتان دەربهێنێ. وترا: بەرەکەتەکانی زەوی چین؟ فەرموی ﷺ: جوانی و گەشاوەیی دنیایە – واتە ئەوەی لەناویدایە لە کەلوپەل و ئاژەڵ و پۆشاك و کشتوکاڵ ونەوت ... کە خەڵکی شانازی پێوەدەکەن لەگەڵ کەمی مانەوەکەی – . پیاوێك پێی وت: ئایا باشی شەڕ و خراپە دەهێنێت؟ پێغەمبەری خودا ﷺ بێدەنگ بو بەجۆرێك وامان زانی کە وەحی بۆ دێت، ئنجا دەستی کرد بەلابردنی ئارەق لەنێوچەوانیداو فەرموی ﷺ : لە کوێیە پرسیارکەرەکە: ئایا باشی خراپەو شەر دەهێنێت؟ پیاوەکە وتی: من ئەوەم، ئەبو سەعید دەڵێ: کاتێ ئەمەی کرد سوپاسمان کرد، پێغەمبەری خودا ﷺفەرموی: باشی تەنها باشی دەهێنێت– سێ جار– بەڵام ئەم مال و سامانە سەوزو شیرینە، لە بەھاردا – بە ویستی خودا – گژو گیایەکی زۆر پێدەگا و ئاژەڵ زۆری لێدەخوات تاوەکو زگی گرتەك دەبێ جا دەمرێت یان نزیکی دەکاتەوە لە مردن، تەنها ئەو ئاژەڵە گیاخۆرە نەبێت، کە گیای خواردوە تاوەکو هەردوو پۆتەکەی لێك دەکشێن، جا ڕوو لە خۆر دەکا وکاوێژ دەکاو پیساتیەکەی بە ئاسانی فڕە دەداو میز دەکا، پاشان دەگەرێتەوەو دەخوات – دوای ئەوەی کە سووك بو –، ئەم مال و سامانەش دیمەن جوان و شیرینە، هەر کەسێك بە حەلالی پەیدای بکاو، لە ڕێگا شەرعیەکاندا سەرفی بکا، باشترین یارمەتیدەرە بۆ ئەو لەسەر ئاین، هەر کەسێکیش بە حەرامی پەیدای بکا، وەکو ئەو کەسەیە کە دەخوات و تێر نابێت.

**لە سودەکانی فەرمودە:**

١– هێنانەوەی نمونە بە شتی بێ نرخ دروستە وەکو میز.

٢– دروستە قوتابی شتە کورتکراوەوەکان بخاتە بەردەم زاناو، زاناش ئەگەر پرسیارێکی ئاراستەکرا ، وەلأمەکەی دوابخات تاوەکو دڵنیا دەبێت.

٣– نکوڵی لە پرسیارکردنێك دەکرێ، ئەگەر لە شوێن خۆی دا نەبو.

٤– ئەگەر زانایەك پرسیارێکی لێکراو ئەو کات وەلأمەکەی لانەبو، یان لێی ئالۆز بو ، وەلأمەکە دوادەخات تاوەکو زانینی .

٥– وەدەستهێنانی مال لە ڕێگەی حەرامەوە بەرەکەتی تێدا نابێت و خاوەنەکەی سودی لێناکات.

٦– هاندان بۆ پەیڕەوکردنی سیستەمی مام ناوەندێتی ( وسط ) لە ماڵ و ساماندا، نە تێپەڕاندن و نەکەمتەرخەمی.

٧- هاندان بۆ خێرکردن و دەست نەگرتنەوە.

٨- دورکەوتنەوە لە رکابەریکردن لە کارە خراپەکاندا.

٩- دورکەوتنەوە لە زۆر خواردن و زیادەڕەوی.

١٠- ئەم فەرمودەیە دوو نمونەی تێدایە بۆ وێناکردنی ماڵ و سامانی دنیا:

یەکەم : ئەو کەسەی ماڵی دنیا کۆدەکاتەوە لە ئەندازە پتر و لە رێگاکانی شەرعیدا نایبەخشێت، وەکو ئەو ئاژەڵە وایە کە زۆر گژوگیای بەهاری دەخوات و زگی گرتەك دەبێ ، جا ریخۆلەکەکانی دەپچڕێن و دەمرێت یان لە مردن نزیك دەبێتەوە.

دووەم: ئەو کەسەی لە ئەندازە پتر کۆناکاتەوەو لە رێگا شەرعیەکانیدا سەرفی دەکا، وەکو ئەو ئاژەڵەیە کە دەخوات تاوەکو هەردوو پۆتەکەی لێك دەکشێن ، ئنجا پاشماوەکانی خواردنی دادەنێت ، پاشان دەخواتەوە.

أخبرنا أبو عبد الله الحافظ ، أنا دعلج بن أحمد ، ثنا محمد بن علي بن زيد الصايغ ، ثنا أحمد بن شبيب ، ثنا أبي ، عن يونس ، عن ابن شهاب ، عن خالد بن أسلم قال : خرجنا مع عبد الله بن عمر فقال أعرابي : يقول الله عز وجل : { والذين يكنزون الذهب والفضة } فقال ابن عمر : " من كنزهما فلم يؤد زكاتهما فويل له ، إنما كان هذا قبل أن تنزل الزكاة ، فلما نزلت جعلها الله طهرا لأموالهم ، ثم التفت إلي فقال : ما أبالي لو كان لي مثل أحد ذهبا ، أعلم عدده، وأزكيه ، وأعمل فيه بطاعة الله تعالى ". رواه البخاري في الصحيح فقال : وقال أحمد بن شبيب.

أخبرنا أبو عبد الله الحافظ ، ثنا أبو العباس محمد بن يعقوب ، ثنا الحسن بن علي بن عفان ، ثنا قبيصة بن عقبة ، عن سفيان ح قال : وحدثنا أبو العباس ، ثنا بكر بن سهل الدمياطي ، ثنا محمد بن أبي السري ، ثنا وكيع بن الجراح ، عن سفيان الثوري ، عن الحجاج بن فرافصة ، عن مكحول ، عن أبي هريرة ﷺ ، قال في رواية قبيصة : أراه رفعه ، وقال في رواية وكيع : قال : قال رسول الله ﷺ : **" من طلب الدنيا حلالا، مفاخرا، مكاثرا ، مرائيا، لقي الله وهو عليه غضبان ، ومن طلب الدنيا حلالا استعفافا عن المسألة ، وسعيا على عياله ، وتعطفا على جاره ، لقي الله يوم القيامة ووجهه كالقمر ليلة البدر "**. هكذا قال مكحول عن أبي هريرة ومكحول لم يسمع من أبي هريرة وكأنه أخذه عن بعض أصحاب أبي هريرة عن أبي هريرة.

**واتای فەرمودە:**

هەر کەسێك داوای دنیا بکات لە رێگەی حەلالەوەو، داواکردنەکەی بۆ خۆبەگەورەدانان و زۆربونی ماڵ بێ - نەك بۆ باشکردنی ئێستای و سەرف کردنی بۆ باشکردنی دوارۆژ -، پێش چاوی پێ بکا، دەگەڕێتەوە لای خوداو خوداش لێی تووڕەیە، هەر کەسێکیش داوای دنیا بکا لە رێگەی حەلالەوەو، مەبەستی خۆپاراستن بێ لە داواکردنی مال لە خەڵك و، بژێودانی ماڵ و منداڵەکەی و، چاکەکردن لەگەڵ دراوسێ یەکانی ، ئەو کەسە دەگەڕێتەوە لای خودا لە رۆژی دوایداو

روخسارەکەی وەکو مانگی شەوی چواردەیە.

**لە سودەکانی فەرمودە:**

١- پێویستە موسڵمان ماڵی خۆی لە ڕێگەیەکی حەلالەوە پەیدا بکات و، دوورکەوێتەوە لە ڕێگاکانی حەرام.

٢- کۆکردنەوەی ماڵ لە ڕێگەی حەلالەوە دروستە، ئەگەر کۆکردنەوەکە بۆ ئەو بێت، کە مافی خودای لێ بداو، پێویستی بەخەڵك نەبێ و، بۆ بژێودانی خۆی و منداڵەکانی بێ و، یارمەتی دراوسێی بدا، ئەگینا کۆکردنەوەی ماڵ باش نییە.

٣- ئەو کەسەی ماڵ لە ڕێگەی حەلالەوە پەیدا دەکا، و خەرجی دەکا وەکو خودا فەرمانی پێکردووە، ئەوا روخسارێکی گەشاوەی هەیە ، لە دوارۆژدا، پێی دەناسرێتەوە.

## الباب الثاني والعشرون: في الأخذ من الحلال، واجتناب المحارم، والتورع عن الشبهات

## بابەتی بیست و دوو: وەرگرتن لە حەلال و، خۆپاراستن لە حەرامەکان و، پارێزگاری لە شتە گوماندارەکان

أخبرنا أبو محمد جناح بن نذير بن جناح المحاربي القاضي ، بالكوفة ثنا أبو جعفر محمد بن علي بن دحيم ، ثنا أحمد بن حازم يعني ابن أبي غرزة ، ثنا يعلى بن عبيد ، والفضل بن دكين قالا : ثنا زكريا بن أبي زائدة ، عن الشعبي قال : سمعت النعمان بن بشير يقول : سمعت رسول الله ﷺ يقول وأومأ النعمان بإصبعيه إلى أذنيه : **" إن الحلال بيِّن ، والحرام بيِّن ، وبين ذلك مُشتبِهات لا يعلمها كثير من الناس ، فمن اتّقى المشتبهات فقد استبرأ لدينه ولعِرضه ، ومن وقع في المشتبهات وقع في الحرام ، كالراعي يرعى حول الحمى أوشك أن يقع فيه ، ألا إن لكل ملك حِمى ، وإن حِمى الله محارمه ". وأخبرنا أبو عبد الله الحافظ ، ثنا أبو بكر أحمد بن إسحاق الفقيه إملاء ، أنا موسى بن الحسن بن عباد ، وعمرو بن تميم قالا : ثنا أبو نعيم ، وهو الفضل بن دكين فذكره بإسناده ومعناه ، وزاد : " ألا وإن في الجسد مضغة إذا صَلَحت صلَح الجسد كله ، وإذا فسدت فسد الجسد كله ، ألا وهي القلب "**. رواه البخاري عن أبي نعيم ، وأخرجه مسلم من أوجه عن زكريا.

**واتای فەرمودە:**

شتە حەلالەکان دیارن، شتە حەرامەکانیش دیارن، لەنێوان هەردوکیاندا چەند شتێکی تێکەڵاوو گوماندار هەن کە زۆربەی خەڵکی نایزانن - ئاخۆ حەرامن یا حەلال -، هەر کەسێك خۆی لە شتە تێکەڵاوەکان بپارێزێ ، ئەوپەڕی بێ تاوانی ئەوە بۆ ئایینەکەی - کە لۆمەی شەرعی بکرێ و- بۆ ناموسەکەی - کە تانەی لێ بدرێ -، هەر کەسێکیش کەوتە ناو شتە تێکەڵاوەکان ئەوە کەوتوتە ناو حەرامەوە، وەکو ئەو شوانەی کە ئاژەڵەکەی لە دەوروبەری پاوان دەلەوەڕێنێ و نزیکە

بچـنە نـاو پاوانەكـەوە، ئاگـاداربن! هـەمو پادشـايەك پـاوانی هەيـە، پـاوانی خـوداش شـتە حەرامكراوەكانن. ئاگاداربن! لەناو لاشەی مرۆڤدا پارچە گۆشتێك هەيە ، ئەگەر ئەو پارچە گۆشتە باش بو، هەمو ئەندامەكانی تری لاشە باش دەبن، ئەگـەريش خـراپ بـو، گشـت ئەندامـەكانی تـری لاشە خراپ دەبن، ئاگاداربن ! ئەو پارچە گۆشتە دڵە.

**لە سودەكانی فەرمودە:**

١- پێشەوا ( النووي) دەڵێ:" زانايان يەكدەنگن لەسـەر گـەورەيی شـوێنی ئـەم فەرمودەيـەو زۆری سـودەكانی و يەكێكـە لـەو فەرمودانـەی كـە خولگـەی ئيسـلامی لەسـەرە، كۆمـەڵێك وتويانـە: سێيەكی ئيسلامە". صحيح مسلم بشرح النووي، ١١/ ٢٧.

٢- هەروا پێشەوا ( النووي ) دەڵێ: " شتەكان سێ بەشن: شتێكە حەلاڵێكی ديارو ئاشـكرايەو هـيچ ناديارێك لە حەلاڵبونيدا نيە، وەكو نان و ميوەجات و زەيت و هەنگوين و رۆن و ... ئاخـاوتن و تەماشاكرن و رۆيشتن و ... شتی حەرامی دياريش وەكـو مـەی و بـەرازو مـردارو ميـزو... زينـاو درۆو غەيبەت و دووزبانی و تەماشاكردنی ئافرەتی بێگانەو...شتە تێكەڵاوەكانيش واتە حەلاڵ و حەراميان ديار نيە، بۆيە زۆربەی خەڵكی نايانزانن، بەڵام زانايـان حوكمەكـەيان دەزانـن بـە دەق يان پێوان ... ". صحيح مسلم بشرح النووي، ١١/ ٢٧، ٢٨.

٣- قفڵ كردنی گشت ئەو دەرگايانەی كـە بـۆنی حـەراميان لێدەكرێت ، بـۆ ئـەوەی نەكەويتـە نـاو حەرامەوە.

٤- هاندان بۆ باشكردنی دڵ و چاودێريكردنی و گـەورەيی پلەوپايەكـەی و مـاڵی حـەلال كاريگـەری بەسەر دڵەوە هەيە.

٥-پارێزگاريكردن لەسەر كاروبارەكانی ئايين.

وروي عن سعد بن أبي وقاص وغيره مرفوعا : **" فضل العلم أحبُّ إلي من فضل العبـادة ، وخـير دينكم الوَرَع ".**

**واتای فەرمودە:**

زياتر زانسـت خۆشەويسـترە لـەلای مـن لـە زيـاتر پەرسـتش و ، باشـترين كـاری ئايينتـان لـە خوداترسانە.

وعن أبي هريرة ، أن النبي ﷺ قال له : **" يا أبا هريرة ، كن ورِعاً، تكن أعبَدَ الناس ".**

**واتای فەرمودە:**

ئەی ئەبو هورەيرە ، بترسـێ لـەخودا ، بـۆ ئـەوەی لەهـەمو خـەڵكی زيـاتر ببيتـە بەنـدەی خودا.

## الباب الثالث والعشرون : في بر الوالدين
## بابەتی بیست و سێ: چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوك

أخبرنا أبو عبد الله محمد بن عبد الله الحافظ ، ثنا أبو العباس محمد بن يعقوب ، ثنا جعفر بن محمد بن شاكر ، ثنا محمد بن سابق ، ثنا مالك بن مغول قال : سمعت الوليد بن العيزار ، عن أبي عمرو الشيباني قال : قال عبد الله بن مسعود : سألت رسول الله ﷺ : أيُّ العمل أفضل ؟ قال : " **الصلاةُ على ميقاتها** " قلت : ثم أي ؟ قال : " **ثم برُّ الوالدين** " قال : قلت : ثم أي ؟ قال : " **الجهاد في سبيل الله** " قال : فسكت عني رسول الله ﷺ ، ولو استزدته لزادني . رواه البخاري في الصحيح عن الحسن بن الصباح عن محمد بن سابق.

**واتای فەرمودە:**

عەبدوللای کوڕی مەسعود ﷺ وتی: لە پێغەمبەری خوام پرسی ﷺ : کامە کردەوە باشترە؟ فەرموی ﷺ: نوێژکردن لە کاتی خۆیدا. وتم: پاشان کامە؟ فەرموی ﷺ: پاشان چاکەکردن دەگەڵ دایك و باوکدا. وتم: ئنجا کامە؟ فەرموی ﷺ: جیهاد کردن لە ڕێگەی خودادا. عەبدوللای کوڕی مەسعود ﷺ وتی: پێغەمبەری خودا ﷺ بێدەنگ بو، ئەگەر داوای زیاترم لێبکردایە زیاتری بۆ دەگوتم.

**لە سودەکانی فەرمودە:**

١- پێشەوا ( الطبري ) دەڵێ:" پێغەمبەری خوداﷺ بەتایبەتی باسی ئەم سێ کردەوەیەی کرد، چونکە ناونیشانن لەسەر پەرستشەکانی تر". عمدة القاري للعيني، ١٤/ ٧٩.

٢- گەورەیی نوێژ کردن لە کاتی خۆیدا.

٣- گەورەیی چاکە کردن لەگەڵ دایك و باوکداو باشبوون لەگەڵیان.

٤- جیهاد کردن لەڕێگەی خودادا لە کارە زۆر باشەکانە.

أخبرنا محمد بن عبد الله الحافظ ، ثنا أبو عبد الله محمد بن يعقوب الحافظ ، ثنا إبراهيم بن عبد الله السعدي ، ثنا أبو بدر شجاع بن الوليد ثنا عبد الله بن شبرمة ، عن أبي زرعة بن عمرو بن جرير ، عن أبي هريرة ﷺ قال : قال رجل : يا رسول الله ، من أحقُّ منِّي بحُسن الصُّحبة ؟ قال : " **أمُّك** " قال : ثم من ؟ قال : " **ثم أمك** " قال : ثم من ؟ قال : " **ثم أمك** " قال : ثم من ؟ قال : " **ثم أبوك** ". أخرجه البخاري ، ومسلم في الصحيح من حديث ابن شبرمة.

**واتای فەرمودە:**

پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ! کێ شایەنترە کە من چاکەی لەگەڵدا بکەم؟ فەرموی ﷺ: دایکت. وتی: پاشان کێ؟ فەرموی: دایکت، وتی: ئنجا کێ ؟ فەرموی: دایکت. وتی: ئنجا کێ؟ فەرموی: پاشان باوکت.

**لە سودەکانی فەرمودە:**

١- گەورەیی دایك و هاندان بۆ چاکەکردن لەگەڵیدا، چونکە ئەو زیاتر ماندوبونی چێژتوە بە منداڵەوە، تا گەورە بوە.

٢- نیزیکە زانایان یەکدەنگ بن لەسەر وەپێشخستنی دایك لە چاکە لەگەڵ کردندا لە باوك.

٣- گەورەیی باوك و چاکە کردن لەگەڵیدا.

٤- پێغەمبەر ﷺ سێ جار باسی دایکی کرد، لەبەرامبەر سێ شتدا، کە تایبەتن بەدایك، ئەوانیش: ماندوبوونی دووگیانی و، ئازاری منداڵ دانان و، ڕەنجی شیردان.مرقاة المفاتيح شرح مشكاة المصابيح، ٩/ ١٣٢.

وفي حديث عطاء بن السائب ، عن أبي عبد الرحمن السلمي ، عن أبي الدرداء قال : سمعت رسول الله ﷺ يقول : " **إنَّ الوالدَ أوسَط أبواب الجنة ، فاحفظ ذلك الباب أو دَعْه** ".أخبرناه أبو عبد الله الحافظ ، ثنا أبو العباس الأصم ، ثنا أحمد بن شيبان ، ثنا سفيان بن عيينة ، عن عطاء ، فذكره.

**واتای فەرمودە:**

بەهەشت چەند دەرگایەکی هەیە، باشترین دەرگاش بۆ چونە ژوورەوەی دەرگای ناوەندە، هۆی چونە ناو دەرگای ناوەندەوەش پارێزگاریکردنە لە مافەکانی باوك . جا ئەو دەرگایە بپارێزە و بەدەستی بهێنە یان وازی لێ بهێنەو لەدەستی بدە.

**لە سودەکانی فەرمودە:**

١- گەورەیی باوك و پارێزگاریکردن لەسەر مافەکانی ڕێگەیەکە لە ڕێگاکانی چونە بەهەشت.

٢- دورکەوتنەوە لە ئازاردانی باوك .

٣- گرنگی دانی ئیسلام بە پێکهاتەی خێزان.

## الباب الرابع والعشرون : في صلة الرحم

### بابەتی بیست و چوار: سەردانی خزمان ( بەندیواری خزمایەتی )

أخبرنا محمد بن عبد الله الحافظ ، ثنا أبو الحسن علي بن محمد بن سختويه ، ثنا أبو عبد الله محمد بن إبراهيم البوشنجي ، وأحمد بن إبراهيم بن ملحان قالا : ثنا يحيى بن بكير ، ثنا الليث ، عن عقيل ، عن ابن شهاب ، أخبرني أنس بن مالك ، أن رسول الله ﷺ قال : " **من أحبَّ أن يُبسط له في رزقه ، ويُنسأ له في أثره ، فلْيصلِ رحمه** ". رواه البخاري عن يحيى بن بكير ، وأخرجه مسلم من وجه آخر عن الليث وروي عن عاصم بن ضمرة ، عن علي ﷺ عن النبي ﷺ بمعناه ، وفيه من الزيادة : " **ويدفع عنه مِيتة السوء ، فليتقِ الله، وليصل رحِمَه** ".

**واتای فەرمودە:**

هەر کەسێك دەیەوێ ڕزقی زۆر بێ و، تەمەنی درێژ بێ ، با سەردانی خزمەکانی بکا.

لە گێردراوەیەکی تردا: هەر کەسێك دەیەوێ ئاخیری خێربێ، با لە خوا بترسێ و، سەردانی خزمانی بکا.

**لە سودەکانی فەرمودە:**

١- سەرەتا پرسیارێك دێتە پێشەوە ، باشە تەمەن و ڕزق دانداراون و زیاد و کەم ناکەن، ئەی چۆن سەردانی خزمان تەمەن درێژ دەکا؟

پێشەوا ( النووي ) دەڵێ:" زانایان وەڵام گەلێکیان داوەتەوە، ڕاستی ئەو وەڵامانە ئەوەیە، کە ئەم تەمەن درێژیە بە بەرەکەت خستنە ناو تەمەنەکەی و یارمەتی دانی بۆ پەرستشەکان و ئاوەدانکردنەوەی کاتەکانی بەو کارانەی سودی پێدەگەیەنن لە دوارۆژدا...". صحیح مسلم بشرح النووي، ١٦/ ١١٤.

٢- گەورەیی سەردانی خزمان و هاتوچۆکردنیان.

٣- بایەخدانی ئیسلام بە تۆکمەکردنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان.

أخبرنا أبو محمد عبد الله بن يوسف الأصبهاني ، ثنا أبو سعيد هو ابن الأعرابي ثنا الحسن بن محمد الزعفراني ، ثنا سفيان بن عيينة ، عن الزهري ، وأخبرنا أبو الحسن بن بشران البغدادي ، ثنا إسماعيل بن محمد الصفار ، ثنا أحمد بن منصور الرمادي ، ثنا عبد الرزاق ، أنا معمر ، عن الزهري ، عن محمد بن جبير بن مطعم ، عن أبيه قال : سمعت النبي ﷺ ، وفي رواية ابن عيينة : عن النبي ﷺ قال : **" لا يدخلُ الجنةَ قاطعٌ "**. رواه مسلم عن ابن أبي عمر وغيره ، عن سفيان ، ومحمد بن رافع ، وعبد بن حميد عن عبد الرزاق وأخرجه البخاري من وجه آخر عن الزهري.

**واتای فەرمودە:**

ناچێتە بەهەشتەوە کەسێك کە سەردانی خزمەکانی ببڕێت و هاتوچۆیان نەکات.

**لە سودەکانی فەرمودە:**

١- بڕینی سەردانی خزمان گوناهێکی گەورەیە.

٢- مەبەست لە نەچونە بەهەشتەوە ئەوەیە: کەسەکە لەسەرەتادا ناچێتە بەهەشتەوە.

أخبرنا الأستاذ أبو بكر محمد بن الحسن بن فورك ، أنا عبد الله بن جعفر ، ثنا يونس بن حبيب ، ثنا أبو داود ، ثنا شعبة ، أخبرني محمد بن عبد الجبار قال : سمعت محمد بن كعب القرظي يحدث عن أبي هريرة قال : سمعت رسول الله ﷺ يقول : **" إن للرَّحِم لَلسانا يومَ القيامة تحت العرش ، يقول : يا رب قُطِعتُ ، يا رب ظُلِمت ، يا رب أُسيء إليَّ ، فيُجيبها ربها : ألا ترضين أن أصِل من وصلك ، وأقطَع من قطعك "**. هذا إسناد صحيح وقد رواه معاوية بن أبي مزرد عن سعيد بن يسار ، عن أبي هريرة ﷺ ، عن النبي ﷺ ، أتم منه بمعناه . ومن ذلك الوجه أخرجه البخاري ، ومسلم في

الصحيحين.

**واتای فەرموده:**

بەندیواری خزمایەتی لە رۆژی دوایدا زبانێکی هەیە لە ژێر عەرشی خودادا، دەڵێ: ئەی پەروەردگارم! من برِام، ئەی پەروەردگارم! ستەمم لێکرا، ئەی پەروەردگارم! خراپەم لەگەڵ کرا، جا پەروەردگارەکەی وەڵامی دەداتەوە: ئایا تۆ ناتەوێ کە من رەحم بەو کەسە بکەم کە بەندیواری خزمایەتی جێبەجێ دەکاو، ئەو کەسەش سزا بدەم کە بەندیواری خزمایەتی جێبەجێ ناکا.

**لە سودەکانی فەرموده:**

- گەورەیی سەردانی خزمان و بەندیواری خزمایەتی بەتێکرا پێویستەو پچڕاندنی گوناهێکی گەورەیە.

## الباب الخامس والعشرون: في رحمة الأولاد وتقبيلهم ، والإحسان إليهم وإلى الأهلين

## بابەتی بیست و پێنج : رەحمکردن بە مندالآن و ماچکردنیان و، چاکەکردن دەگەڵیان و لەگەڵ خزمان

أخبرنا أبو طاهر الفقيه ، أنا أبو بكر محمد بن الحسين القطان ، ثنا أحمد بن يوسف السلمي ، ثنا محمد بن يوسف قال : ذكر سفيان ، عن هشام بن عروة ، عن أبيه ، عن عائشة رضي الله عنها قالت : جاء أعرابي إلى النبي ﷺ فقال : أتقبِّلون الصِّبيان، فما نقبِّلهم ؟ فقال رسول الله ﷺ : **" أوَ أملِكُ لكَ، أن نزع الله من قلبك الرحمة "**. رواه البخاري في الصحيح عن محمد بن يوسف ، وأخرجه مسلم من وجه آخر عن هشام.

**واتای فەرموده:**

دەشتەکیەك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و وتی: ئایا ئێوە مندالّەکانتان ماچ دەکەن؟ ئێمە ماچیان ناکەین، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: من ناتوانم رەحمەت بخەمە ناو دڵتەوە، دوای ئەوەی خودا رەحمەتی لێ دەرهێناوە.

**لە سودەکانی فەرموده:**

١- گرنگیدانی ئیسلام بە مافەکانی مندالّ.

٢- رەفتارکردن لەگەڵ مندالّان بەنەرم و نیانی و لەسەرخۆیی و بێ توندوتیژی.

أخبرنا أبو عبد الله الحافظ ، ثنا أبو بكر بن إسحاق إملاء ، أنا يوسف بن يعقوب ، ثنا سليمان بن حرب ، وعارم ، وأبو الربيع ، ومحمد بن عبيد ، ومسدد ، ومحمد بن أبي بكر ، قالوا : أنا حماد بن زيد ، ثنا أيوب ، عن أبي قلابة ، عن أبي أسماء ، عن ثوبان قال : قال رسول الله ﷺ : **" أفضل دينار يُنفِقه الرجل : دينارٌ ينفقه على عَياله ، دينار ينفقه الرجل على دابَّته في سبيل الله ، دينار ينفقه الرجل على أصحابه في سبيل الله "**. قال أبو قلابة : وبدأ بالعيال ، فأي رجل أعظم أجرا ينفق

على عيال صغار يقوِّتهُم الله تعالى ، وينفعَهم به . رواه مسلم في الصحيح عن أبي الربيع.

**واتای فەرمودە:**

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموی: باشترین دینار کە مرۆڤ دەیبەخشێ ، دینارێکە کە دەیبەخشێتە مندالەکانی و، دینارێکیشە کە مرۆڤ دەیبەخشێتە ولاغەکەی لە رێگەی خواداو، دینارێکە کە مرۆڤ دەیبەخشێتە یاوەرانی لە رێگای خوادا.

**لە سودەکانی فەرمودە:**

١- گەورەیی بەخشینی ماڵ لە پێناو خودادا ، ئەگەر بەسەر ئەم سێ کۆمەڵانەدا بێت باشترە.

أخبرنا أبو عبد الله محمد بن الفضل بن نظيف الفراء ، بمكة ثنا العباس بن محمد بن النضر بن السري الرافعي ، إملاء بمصر ، ثنا هلال بن العلاء ، ثنا محمد بن كثير ، ثنا سفيان ، عن مزاحم بن زفر ، عن مجاهد ، عن أبي هريرة قال : قال رسول الله ﷺ : " **ديناراً أعطيتَه في سبيل الله ، ودينارا أعطيتَه مسكينا ، ودينارا أنفقتَه على أهلك ، قال : الدينار الذي تُنفقه على أهلك أعظمُها أجرا** ". وأخبرنا علي بن أحمد بن عبدان ، أنا أحمد بن عبيد الصفار ، ثنا تمتام ، ثنا أبو حذيفة ، ثنا سفيان ، فذكره بإسناده ومعناه ، زاد : " **ودينارا أعطيته في رقبة** ". أخرجه مسلم عن أبي بكر بن أبي شيبة وزهير بن حرب عن وكيع عن سفيان واتفقا على حديث أبي هريرة وغيره ، عن النبي ﷺ أنه قال : " **وابدأ بمن تعول** ".

**واتای فەرمودە:**

دینارێك لە رێگەی خودادا بیبەخشی و ، دینارێك بە هەژارێك بدەی و، دینارێکیش بە مندالەکانت و خزمەکانت بدەی - واتە کامەیان باشترە -، فەرموی ﷺ : ئەو دینارەی بە مندالەکانت و خزمەکانت دەدەی خێری لەهەموان گەورەترە.

**لە سودەکانی فەرمودە:**

١- بەخشینی ماڵ بەسەر منداڵ و خزم و کەسەکانت باشترە، چونکە هەم خێرەو هەم بەجێگەیاندنی بەندیواری خزمایەتیە.

٢- هەوڵدانی ئیسلام بۆ مانەوەی خێزان و تۆکمەکردنی پەیوەندی نێوان ئەندامەکانی.

- وروينا عن عائشة رضي الله عنها ، عن النبي ﷺ أنه قال : " **خيرُكم خيركم لأهله ، وأنا خيركم لأهلي** ".

**واتای فەرمودە:**

باشترینتان ئەو کەسەیە کە دەگەڵ هاوسەرو مندالەکانی وخزمەکانی باش بێ، منیش لەهەموتان باشترم بو هاوسەرو مندالەکان و خزمەکانم.

**لە سودەکانی فەرمودە:**

١- گەورەیی ڕەوشتە بەرزەکانی پێغەمبەر ﷺ.

٢- هاندان بۆ باش ڕەفتارکردن لەگەڵ ئافرەتان و، یارمەتیدانیان لە کارەکانیاندا.

أخبرنا أبو عبد الله الحافظ في آخرين ، قالوا : أنا أبو العباس محمد بن يعقوب ، ثنا عبيد الله بن سعيد بن كثير بن عفير ، حدثني أبي ، حدثني الليث بن سعد ، عن هشام بن سعد ، عن زيد بن أسلم ، عن يزيد بن عياض بن جعدبة ، أنه سمع ابن السباق يقول : سمعت أبا هريرة يقول : قال رسول الله ﷺ : **" خيرُكم خيركم لنسائه ولبناته "**. قال الشيخ: يزيد بن عياض : هذا هو جد يزيد بن عياض بن يزيد الذي يروي عنه ابن وهب ، ويقال يزيد بن جعدبة.

**واتای فەرمودە:**

باشترینتان ئەو کەسەیە کە لەگەڵ خێزانەکەی و کچەکانی باش بێت.

**لە سودەکانی فەرمودە:**

١- بایەخدانی ئیسلام بە مافەکانی ئافرەتان و هاندانی بۆ باش بون لەگەڵیاندا و بەرەنگاربونەوەی توندوتیژی دژیان.

٢- بایەخدانی ئیسلام بە کچ و پێویستە بەباشی ڕەفتارو هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکرێ.

## الباب السادس والعشرون : في الإحسان إلى المماليك
## بابەتی بیست و شەش : چاکەکردن لەگەڵ کۆیلەکان

أخبرنا أبو عبد الله الحافظ ، ثنا أبو العباس محمد بن يعقوب ، ثنا الحسن بن علي بن عفان ، ثنا ابن نمير ، عن الأعمش ، عن المعرور بن سويد قال : لقينا أبا ذر بالربذة عليه ثوب ، وعلى غلامه ثوب مثله ، فقال له رجل : يا أبا ذرّ ، لو أخذت هذا الثوب من غلامك فلبسته، فكانت حلة ، وكسوت غلامك ثوبا آخر ، فقال : إن رسول الله ﷺ قال : **" هم إخوانُكم ، جعلهم الله تحت أيديكم ، فمن كان أخوه تحت يده فليُطعِمه مما يأكل ، وليُلبِسه مما يلبس ، ولا يكلِّفه ما يَغلبه ، فإن كلفه فليُعِنه "**. أخرجه البخاري ، ومسلم في الصحيح من حديث الأعمش، وهذا هو الأفضل أن يفعل ، وإلا فله ما قال رسول الله ﷺ : **" للمملوك طعامُه وكسوتُه بالمعروف "**. قال الشافعي ﷺ : والمعروف عندنا المعروف بمثله في بلده الذي يكون فيه.

**واتای فەرمودە:**

مەعرور دەڵێ: ئێمە گەیشتینە ( أبو ذر) لە ( الربذة - شوێنێکی نێزیکەی مەدینەیە) پۆشاکێکی لەبەر بوو، کۆیلەکەشی پۆشاکێکی وێنەی ئەوی لەبەردابو، پیاوێك بە ( أبوذر) ی وت: ئەی ( أبو ذر)! گەر ئەو پۆشاکەت لە کۆیلەکەت وەربگرتایەو لەبەرت بکردایە، ئەوا دەبوە کراسێکی درێژو، پۆشاکێکی ترت لەبەر کۆیلەکەت کردبایە، ( أبو ذر) وتی: پێغەمبەری خودا ﷺ

فەرمویەتی: کۆیلەکان برای ئێوەن، خودا ئەوانی ژێر دەستی ئێوە کردوە، هەر کەسێك براکەی لە ژێر دەستی بو، با بیداتێ لەو خواردنەی کە بەخۆی دەخواو، با لەبەری بکا لەو پۆشاکەی کە بەخۆی لەبەری دەکاو، ئەرکباری نەکا بە کارێك کە لەتوانایدا نیە، ئەگەر ئەرکباری کرد با یارمەتی بدات.

لە گێردراوەیەکدا: خواردن و پۆشاك بە کۆیلە بدەن بە باشی و چاکە – بەگوێرەی شارو کەسەکان–.

حدثنا أبو الحسن محمد بن الحسين العلوي ، أنا عبد الله بن إبراهيم بن بالويه المزكي ، ثنا أحمد بن يوسف السلمي ، ثنا عبد الرزاق ، أنا معمر ، عن همام بن منبه قال : هذا ما حدثنا به أبو هريرة قال : قال رسول الله ﷺ : **" إذا جاء الصّانع بطعام، قد أغنى عنكم حَرَّه ودُخانَه، فادعوه فليأكل معكم ، وإلا فألْقِموهُ في يده ، أو لِتناولوه في يده ".**

**واتای فەرمودە:**

ئەگەر کۆیلەی یەکێکتان خواردنێکی بۆ دروست کردن و، ئێوەی لە گەرمی ئاگرو دووکەڵی خواردنەکەی پاراست، بانگی بکەن با لەگەڵتان بخوا، ئەگینا پارووێکی بخەنە ناو دەستی.

ورواه محمد بن زياد عن أبي هريرة ﷺ قال : قال رسول الله ﷺ : **" إذا جاء خادمُ أحدكم بطعامه فليُجلسه معه ، فإن لم يفعل فليُناوِله أُكْلَةً أو أُكْلَتين ، أو قال : لُقمة أو لُقمتين ، فإنه ولِيَ حَرِّه وعلاجَه ".** أخبرنا أبو عبد الله الحافظ ، ثنا أبو العباس محمد بن يعقوب ، ثنا إبراهيم بن مرزوق ، ثنا سعيد بن عامر ، ثنا شعبة ، عن محمد بن زياد ، فذكره . رواه البخاري في الصحيح عن حفص بن عمر غيره ، عن شعبة وأخرجه مسلم من حديث موسى بن يسار عن أبي هريرة ﷺ .

**واتای فەرمودە:**

ئەگەر خزمەتکاری یەکێکتان خواردنی بۆ هێنان، با خزمەتکارەکەی لەگەڵ خۆی دابنیشێنێ، ئەگەر وای نەکرد با پارووێك یان دوو پارووی بداتێ، چونکە ئەو بەرگەی گەرمی ئاگری خواردنەکەو ئامادەکردنی گرتووە.

**لە سودەکانی فەرمودەکان:**

١– هاندان بۆ باش رەفتارکردن لەگەڵ کۆیلەو خزمەتکار.

٢– بەرەنگاربوونەوەی ئیسلام بۆ کۆیلایەتی و گەڕاندنەوەی مرۆڤایەتی بۆیان.

٣– هاندان بۆ خۆڕازاندنەوە بە ڕەوشتە بەرزەکان.

## الباب السابع والعشرون: في الإحسان إلى الجيران
## بابەتی بیست و حەوت: چاکەکردن لەگەڵ دراوسێ دا

أخبرنا أبو عبد الله الحافظ ، ثنا أحمد بن سليمان الفقيه ، ثنا الحسن بن مكرم ، ثنا يزيد بن هارون ، ثنا يحيى بن سعيد ، أخبرني أبو بكر بن محمد بن عمرو بن حزم ، عن عمرة ، عن عائشة رضي الله عنها قالت : قال رسول الله ﷺ : " **ما زال جبريلُ – عليه السلام – يُوصيني بالجار، حتى ظننت أنه سيُورِّثُه** ". أخرجه البخاري ، ومسلم في الصحيح من حديث مالك عن يحيى بن سعيد.

**واتای فەرمودە:**

هەمیشە جبرائیل – سەلامی خودای لەسەر بێ – وەسیەتی دەکردم کە لەگەڵ دراوسێ باش بم، تاوەکو گومانم برد، کە جبرائیل لەلایەن خوداوە فەرمان دەدا، کە دراوسێ میرات لە دراوسێ دەگرێت.

**لە سودەکانی فەرمودە:**

١- گەورەیی دراوسێ و چاکەکردن لەگەڵیدا.

٢- بایەخدانی ئیسلام بە پتەوکردنی پەیوەندیە کۆمەلایەتیەکان.

## الباب الثامن والعشرون: في إكرام الضيف
## بابەتی بیست و هەشت: رێزگرتن لە میوان

أخبرنا أبو علي الحسين بن محمد الروذباري ، أنا محمد بن أبي بكر ، ثنا أبو داود ، ثنا القعنبي ، عن مالك ، عن سعيد المقبري ، عن أبي شريح الكعبي ، أن رسول الله ﷺ قال : " **من كان يؤمن بالله واليوم الآخر فليُكرِم ضيفَه ، جائزتُه يومٌ وليلة ، الضيافةُ ثلاثة أيام ، وما بعد ذلك فهو صدقة ، ولا يحِلُّ له أن يَثْوِيَ عنده حتى يُحْرِجَه** ". رواه البخاري في الصحيح عن عبد الله بن يوسف ، عن مالك وأخرجه البخاري ، ومسلم من حديث الليث ، عن المقبري.

**واتای فەرمودە:**

هەر کەسێك بڕوای بەخوداو دوارۆژ هەیە با رێز لە میوانەکەی بگرێ، پێبەخشینەکەی رۆژو شەوێکە، میوانداریش سێ رۆژەو، دوای سێ رۆژیش – ئەگەر حەواندیەوە – خێرە، حەلال نیە بۆ میوانەکە لەلای خاوەن ماڵ بمێنێتەوە ، بۆ ماوەیەك کە ئازاری بدات.

**لە سودەکانی فەرمودە:**

١- گەورەیی میوانداری لە ئیسلامداو، پتەوکردنی پەیوەندیە کۆمەلایەتیەکان و، مانەوە لەلای خاوەن ماڵ بەگوێرەی پێویست و بێ بێزارکردن.

٢- گرنگی دانی ئیسلام بە دەستەبەری کۆمەڵایەتی ( التكافل الاجتماعي).

## الباب التاسع والعشرون: في تراحم الناس
## بیست و حەوت: ڕەحم بەیەکتری کردنی خەڵك

أخبرنا أبو محمد عبد الله بن يوسف الأصبهاني ، إملاء ، ثنا أبو سعيد بن الأعرابي ، ثنا الحسن بن محمد بن الصباح الزعفراني ، ثنا سفيان بن عيينة ، عن عمرو بن دينار ، عن نافع بن جبير بن مطعم قال : قال جرير بن عبد الله : سمعت رسول الله ﷺ يقول : **" لا يرحمُ اللهُ من لا يرحمِ الناسَ "**. رواه مسلم في الصحيح ، عن أبي بكر بن أبي شيبة وغيره ، عن سفيان وأخرجاه من حديث أبي ظبيان وزيد بن وهب ، عن جرير.

**واتای فەرموده:**

هەر کەسێك ڕەحم بە خەڵك نەکا، خوداش ڕەحمی پێ ناکا.

**لە سودەکانی فەرموده:**

١- ئەم فەرمودەیە گشت خەڵکی دەگرێتەوەو هانیان دەدا بۆ بەزەیی هاتنەوە بەیەکتریداو دورکەوتنەوە لە دڵڕەقی و ستەم.

## الباب الثلاثون: في رحمة الصغير، وتوقير الكبير، وخدمة المشايخ
## بابەتی سی: بەزەیی هاتنەوە بە گچکەو، ڕێزگرتن لە گەورەو، خزمەتکردنی زانایان

أخبرنا أبو علي الحسن بن أحمد بن إبراهيم بن شاذان البغدادي بها ، أخبرنا عبد الله بن جعفر بن درستويه ، ثنا يعقوب بن سفيان ، ثنا أبو عمرو محمد بن عرعرة بن البرند ، ثنا شعبة ، عن يونس بن عبيد ، عن ثابت البناني ، عن أنس بن مالك قال : صحبت جرير بن عبد الله ، فكان يخدُمُني ، وكان أكبر مني وأسنَّ ، وقال : **" إني رأيت الأنصار يصنعون برسول الله ﷺ شيئا لا أرى أحدا منهم إلا خدمتُه "**. رواه البخاري عن محمد بن عرعرة ، ورواه مسلم عن بندار وغيره ، عن محمد بن عرعرة.

**واتای فەرموده:**

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: بومە هاوڕێی جەریری کوڕی عەبدوللا - لە گەشتدا -، ئەویش خزمەتی منی دەکرد، ئەو لەمن گەورەترو بەتەمەنتر بوو، دەیوت: من یاریدەدەرەکانم دیوە، کە چون خزمەتێکی پێغەمبەریان دەکرد ﷺ، هەر یەکێکیان ببینم خزمەتی دەکەم.

**لە سودەکانی فەرموده:**

١- گەورەیی یاریدەدەرەکان.

٢- گەورەیی جەریرو خۆبەکەم زانینی و خۆشویستنی بۆ پێغەمبەرﷺ.

٣- خزمەتکردنی زانایانی شارەزاو لە خودا ترس.

أخبرنا أبو محمد بن يوسف الأصبهاني ، أنا أبو سعيد بن الأعرابي ، ثنا محمد بن إسماعيل ، ثنا يونس بن محمد ، ثنا مطر الأعنق ، عن ثابت ، عن أنس قال : قال رسول الله ﷺ : **" يا أنسُ ، وقِّرِ الكبيرَ ، وارْحمِ الصغيرَ ، تُرافِقْني في الجنة "**.

**واتای فەرموودە:**

ئەی ئەنەس! ڕێزی گەورە بگرەو، بەزەییت بە گچکە بێتەوە، دەبیتە دۆستی من لە بەهەشتدا.

**لە سوودەکانی فەرموودە:**

١- ڕێزگرتنی گەورە .

٢- بەزەیی هاتنەوە بە گچکە.

٣- ئەم دوو ڕەوشتەی سەرەوە هۆکارێکن بۆ چونە بەهەشتەوە.

٤- بایەخدانی ئیسلام بە بوونی ڕێز لەیەکتر گرتن لەنێوان تاکەکانی کۆمەڵگادا.

## الباب الحادي والثلاثون : في النصح لكل مسلم، والدلالة على الخير
## بابەتی سی و یەك : ئامۆژگاریکردنی هەموو موسڵمانێك و، ڕێگانیشاندان بۆ کاری چاکە

أخبرنا أبو عبد الله الحافظ وأبو زكريا بن أبي إسحاق ، وأبو بكر أحمد بن الحسن ، وأبو عثمان بن عبدان النيسابوري ، قالوا : أنا أبو العباس محمد بن يعقوب ، ثنا زكريا بن يحيى بن أسد ، ثنا سفيان ، ح وأخبرنا أبو عبد الله ، وأبو زكريا ، وأبو بكر ، وأبو نصر أحمد بن علي بن شبيب القاضي ، قالوا : ثنا أبو العباس هو الأصم ، أنا الربيع بن سليمان ، أنا الشافعي ، أنا ابن عيينة ، عن زياد بن علاقة قال : سمعت جرير بن عبد الله البجلي يقول : **" بايعتُ رسولَ الله ﷺ على النُّصح لكل مسلم "**. رواه مسلم عن أبي بكر بن أبي شيبة وغيره ، عن سفيان بن عيينة وأخرجه البخاري من وجهين آخرين ، أحدهما عن زياد بن علاقة.

واتای فەرموودە:

پەیمانم بەست لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ لەسەر ئامۆژگاریکردن بۆ هەموو موسڵمانێك.

**لە سوودەکانی فەرموودە:**

١- گەورەیی ئامۆژگاریکردنی یەکتری لە ئیسلامدا.

٢- ئەگەر هەڵەیەکت لە موسڵمانێك بینی ، یان گوناهێك، بەدانایی و هێمنی و لە کات و شوێنی گونجاودا ئامۆژگاری بکە .

أخبرنا أبو عبد الله الحافظ ، ثنا أبو العباس محمد بن يعقوب ، ثنا الحسن بن علي بن عفان ، ثنا ابن نمير ، ثنا الأعمش ، عن أبي عمرو الشيباني ، عن أبي مسعود الأنصاري قال : أتى النبي ﷺ

رجل فقال : إني أُبْدِعَ بي، فاحملني ، فقال : " **ما عندي ما أحملك عليه ، ولكن ائت فلانا** " ، فأتى رسولَ الله ﷺ ، فأخبره ، فقال رسول الله ﷺ : " **من دلَّ على خيرٍ، فله مِثلُ أجرِ فاعله** ". أخرجه مسلم من أوجه عن الأعمش.

**واتای فەرمودە:**

پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ وتی : ولآغەکەم توانای ڕۆیشتنی نەماوەو لەناوچووە، جا ولآغێکم پێبدە کە هەڵمبگرێ، پێغەمبەریش ﷺ فەرموی: من هیچ ولآغێکم نیە کە تۆ سواری ببی، وەلێ برۆ لای فلانە کەسە – واتە: ئەو دەتوانێ لەسەر ولآغێك هەڵتبگرێ–، جا پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموی:هەر کەسێك ڕێنمایی کەسێك بك – چ بە قسە یان کردار یان ئاماژە یان نوسین – بۆ چاکەیەك، ئەوە ڕێنویکارەکە وێنەی پاداشتی بکەری چاکەکەی هەیە.

**لە سودەکانی فەرمودە:**

١– گەورەیی ڕێگانیشاندان بۆ کردنی کاری چاکە و یارمەتیدانی بکەری چاکە.

٢– گەورەیی فێرکردنی زانست و کارەکانی پەرستش.

## الباب الثاني والثلاثون : في المؤمن يحب لأخيه المؤمن ما يحب لنفسه

### بابەتی سی و دوو : بڕوادار ئەوەی بۆ خۆی پێ خۆشە، ئەوەشی بۆ برا بڕوادارەکەی پێ خۆش دەبێ

أخبرنا أبو عبد الله الحافظ ، ثنا عبد الرحمن بن الحسن الأسدي القاضي ، بهمذان ، ثنا إبراهيم بن الحسين ، ثنا آدم بن أبي إياس ، ثنا شعبة ، ح قال عبد الرحمن : وحدثنا محمد بن أيوب ، أنا مسدد ، ثنا يحيى ، عن شعبة ، عن قتادة ، عن أنس ، عن النبي ﷺ قال : " **لا يُؤْمِن أحدُكم حتى يُحِبَّ لأخيه ما يحبُّ لنفسه** ". رواه البخاري عن مسدد ، عن يحيى ورواه مسلم عن أبي موسى وبندار ، عن غندر ، كلاهما عن شعبة.

**واتای فەرمودە:**

بڕوای هیچ یەکێکتان تەواو نابێ، تاوەکو هەرچی بۆ خۆی پێی خۆشە، بۆ برا موسڵمانەکەشی پێی خۆش دەبێت.

**لە سودەکانی فەرمودە:**

١– موسڵمانان برای یەکترن، بۆیە ئەوەی بۆ خۆی پێ خۆشە لە چاکە و باشی، دەبێ ئەوەشی پێ خۆش بێ بۆ برا موسڵمانەکەی.

٢– بڕوا بەکردەوەی چاك زیاد دەبێ و، بە گوناهیش کەم دەبێت.

٣– موسڵمان بەشداری خۆشی و ناخۆشیەکانی برا موسڵمانەکەی دەکات.

## الباب الثالث والثلاثون: في أن المؤمنين كجسد واحد
## بابەتی سی وسێ: بڕواداران وەك یەك لاشەن

أخبرنا أبو الحسين بن بشران ، أنا أبو جعفر الرزاز ، ثنا محمد بن عبيد الله المنادي ، ثنا إسحاق الأزرق ، ثنا زكريا ، عن الشعبي ، عن النعمان بن بشير ، عن النبي ﷺ قال: **"مثل المؤمنين في تَراحُمِهم وتوادِّهم وتعاطُفِهم كمثل الجسد، إذا اشتكى عُضوٌ منهُ، تَداعى له سائرُ الجسد بالحُمَّى والسَّهرِ "**. رواه البخاري عن أبي نعيم ، عن زكريا بن أبي زائدة وأخرجه مسلم من وجه آخر عن زكريا.

**واتای فەرمودە:**

وێنەی بڕواداران لە بەزەیی بۆ یەكتری و یەكترویستنیان و سۆز بۆ یەكتری وەكو نمونەی لاشەیە، كاتێك ئەندامێكی لاشە هەستی بە ئازار كرد، هەمو ئەندامەكانی تری لاشە توشی تاو شەونخۆنی و ئازار دەبن.

**لە سودەكانی فەرمودە:**

هاندان بۆ یەكبوونی موسڵمانان و سەركەوتن لە یەكبوونی ڕیزەكاندایە.

## الباب الرابع والثلاثون: في مراعاة حق أخيه المسلم
## بابەتی سی وچوار: ڕەچاوكردنی مافی برای خۆی موسڵمان

أخبرنا يحيى بن إبراهيم بن محمد بن يحيى المزكي ، أنا أبو عبد الله محمد بن يعقوب ، ثنا محمد بن عبد الوهاب ، أنا جعفر بن عون ، أنا أبو إسحاق الشيباني ، عن أشعث بن أبي الشعثاء ، عن معاوية بن سويد بن مقرن ، عن البراء بن عازب قال : " أَمَرنا بسبعٍ ونهانا عن سبعٍ – يعني النبي ﷺ – **أمرنا بعيادةِ المريض ، واتِّباع الجنائز ، وإفشاءِ السلام ، وإجابةِ الدَّاعي ، وتَشميتِ العاطِس ، ونَصْرِ المظلوم ، وإبْرارِ المُقْسِم ، ونهانا عن الشُّرب في الفضة ، فإنه من يشرب فيها في الدنيا لا يَشرب فيها في الآخرة ، وعن التَخَتُّم بالذهب ، وعن رُكوب المياثِر ، وعن لِباس القَسِّيِّ، والحرير ، والدِّيباجِ ، والإستبرَقِ** ". أخرجاه في الصحيح من حديث الشيباني وغيره.

**واتای فەرمودە:**

پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێكردین بە حەوت شت و قەدەغەی كردین لە حەوت شت: فەرمانی پێكردین بە سەردانی نەخۆش و، وەدووكەوتنی جەنازەو، بڵاوكردنەوەی سەلام و، وەڵامدانەوەی دەعوەتكارو، ئەگەر – موسڵمانێك – پژمی و گوتی ( الحمدلله) ، تۆش بڵێ: ( يرحمك الله)، سەرخستنی ستەملێكراوو، نەكەوتاندنی سوێندخۆرو، قەدەغەی كردین لە خواردنەوە لە قاپی زیودا، چونكە هەر كەسێك لە دنیادا تیایدا بخواتەوە ،ئەوا لە دوارۆژدا تیایدا ناخواتەوەو، قەدەغەی

کردین له ئەنگوستیلەی زێر – بۆ پیاوان – و، سواربونی ئەو رایەخەی کە لەسەر زینی ولاغ دادەندرێ و له ئاوریشم دروست دەکرێ و، لەبەرکردنی جۆرە پۆشاکێك کە له کەتان دروستکراوەو و تێکەڵە بە ئاوریشم و، قەدەغەی کردین له ئاوریشم و، جۆرە پارچەیەکی نرخدارو باشی ئاوریشم و، پارچەی ئاوریشمی.

**له سودەکانی فەرمودە:**

١– سەردانی نەخۆش له مافەکانی موسڵمانە لەسەر موسڵمان . پێشەوا ( النووي ) دەڵێ :" سەردانی نەخۆش سوننەتە بەیەکدەنگی زانایان ، چ نەخۆشەکە بناسی یان نەیناسی ، چ خزم بێ یان بێگانە " . صحيح مسلم بشرح النووي،١٤/٣١.

٢– وەدواکەوتنی جەنازەی موسڵمان لە مافەکانی موسڵمانە لەسەر موسڵمان. پێشەوا ( النووي ) دەڵێ :" وەدواکەوتنی جەنازە سوننەتە بەیەکدەنگی زانایان ". صحيح مسلم بشرح النووي،١٤/٣١.

٣– وەڵامدانەوەی دەعوەتکار له مافەکانی موسڵمانە لەسەر موسڵمان ، بەمەرجێك توشی گوناه نەبی لەکاتی ئامادەبوندا.

٤– ئەگەر موسڵمان پشمی و گوتی: ( الحمدلله) ، مافی لەسەر موسڵمانە کە پێی بڵێ : ( يرحمك الله) ، ئنجا کەسی پشمی دەڵێ:( يهديكم الله ويصلح بالكم). ئەمەش بە ( فرض الكفاية ) دادەندرێ، ئەگەر یەکێك له ئامادەبوان وەڵامی داوە، ئەوانی تر گوناهبار نابن.

٥– سەرخستنی ستەملێکراو واجبە بەگوێرەی تواناو زیان لێ نەکەوتنەوە.

٦– بڵاوکردنەوەی سەلام و زۆرسەلام کردن، چ کەسەکە بناسی یان نەیناسی و، وەڵامدانەوەی سەلام واجبە بەیەکدەنگی زانایان، جا ئەگەر سەلام لەسەر کراو یەك کەس بو ، ئەوا لەسەری واجبە وەڵام بداتەوە، ئەگەر سەلام لەسەرکراو کۆمەڵێك بون، ئەوا وەڵامدانەوەی سەلام لەسەریان ( فرض الكفاية ) یە، واتە: ئەگەر یەکێکیان وەڵامی داوە، ئەوانی تر گوناهبار نابن، ئەگەر هیچ یەکێکیان وەڵامی نەداوە، گشتیان گوناهبارن.

٧– بەکارهێنانی قاپی زێرو زیو بۆ پیاوان و ئافرەتان حەرامە.

٨– ئەنگوستیلەی زێر بۆ پیاوان حەرامە بەیەکدەنگی زانایان، تەنانەت ئەگەر هەندێکی زێر بێ و هەندێکیشی زیو بێ.

٩– ئاوریشم بۆ پیاوان حەرامە و بۆ ئافرەتان حەلالە.

أخبرنا أبو علي الحسين بن محمد بن محمد بن علي الروذباري ، ثنا أبو بكر محمد بن أحمد بن محمويه العسكري ، بالبصرة سنة إحدى وأربعين وثلاثمائة ، ثنا جعفر بن محمد القلانسي ، ثنا آدم ، ثنا شعبة ، ثنا سعيد بن أبي بردة بن أبي موسى ، عن أبيه ، عن جده قال : قال رسول الله ﷺ : " **على كل مسلم صدقة** " ، قالوا : فإن لم يجد ؟ قال : " **فيعمل بيده، فينفع نفسه، ويتصدق** " ،

قالوا : فإن لم يستطع أو لم يفعل ؟ قال : " **فيُعين ذا الحاجةِ المَلهوفَ** " ، قالوا : فإن لم يفعل ؟ قال : " **فليُمسِك عن الشر، فإنه له صدقة** ". رواه البخاري عن آدم ، ورواه مسلم من وجه آخر ، عن شعبة.

**واتای فەرمودە:**

پێغەمبەر ﷺ فەرموی: هەمو موسلمانێك خێری لەسەرە. وتیان: ئەگەر نەیبو، فەرموی ﷺ: بەدەستی ئیش دەكاو سود بەخۆی دەگەیەنێ و خێریش دەكا. وتیان: ئەگەر نەیتوانی یان نەیكرد، فەرموی ﷺ: یارمەتی خاوەن پێداویستی و لێ قەوماو دەدا. وتیان: ئەگەر نەیكرد، فەرموی ﷺ : با خۆی بگرێتەوە لە خراپە، ئەمەش بۆ ئەو خێرە

**لە سودەكانی فەرمودە:**

١- فراوانی و زۆری دەرگاكانی خێر و چاكە لە ئیسلامدا.

٢- هاندانی تاكەكانی كۆمەڵگا بۆ هاریكاریكردنی یەكتری و یارمەتیدان .

٣- گەورەیی كاركردن و كار بە یەكێك لە هۆكارەكانی وەبەرهێنان دادەندرێ لە ئابووری ئیسلامیدا.

٤- هەوڵدان بۆ سەقامگیری و ئاسایشی كۆمەڵگا و دووركەوتنەوە لە خراپەو ئاژاوەگێری.

أخبرنا أبو عبد الله الحافظ ، ثنا أبو العباس محمد بن يعقوب ، ثنا الحسن بن علي بن عفان ، ثنا عبد الله بن نمير ، عن الأعمش ، عن أبي صالح ، عن أبي هريرة قال : قال رسول الله ﷺ : " **من نفّس عن أخيه كُربةً من كُرَب الدنيا، نفّس الله عنه كُربةً من كرب يوم القيامة ، ومن ستَر على مسلم ستَر الله عليه في الدنيا والآخرة ، ومن يسَّر على مسلم يسَّر الله عليه في الدنيا والآخرة ، والله في عون العبدِ ما كان العبد في عَون أخيه** ". وذكر باقي الحديث كما ذكرناه في أول هذا الكتاب . رواه مسلم في الصحيح عن محمد بن عبد الله بن نمير ، عن أبيه.

**واتای فەرمودە:**

هەر كەسێك ناخۆشیەك لە ناخۆشیەكانی دنیا لەسەر براكەی لابدا، خودا ناخۆشیەك لە ناخۆشیەكانی دوارۆژی لەسەر لادەدا و، هەر كەسێك عەیب و گوناهی موسڵمانێك داپۆشێ ، ئەوا خودا عەیب و گوناهەكانی لە دنیاو دوارۆژدا دادەپۆشێ و، هەر كەسێك ئاسانكاریەك بۆ موسڵمانێك بكا، ئەوا خودا لە دنیاو دوارۆژدا كارەكانی بۆ ئاسان دەكاو، خودا یارمەتی بەندە دەدا، مادەم بەندە یارمەتی براكەی خۆی دەدا.

**لە سودەكانی فەرمودە:**

١- موسڵمان عەیبی برای خۆی موسڵمان دادەپۆشێ .

٢- هەر موسڵمانێك دڵتەنگیەك لەسەر موسڵمانێك لاببا، خودا دڵخۆشی دەكا لە دنیاو دوارۆژدا.

٣- پێویسته موسڵمان فاکتەرێکی ئەکتیڤی چاکە بێت بۆ برا موسڵمانەکەی.

وأخبرنا أبو عبد الله الحافظ ، ثنا أبو العباس محمد بن يعقوب ، ثنا الحسن بن مكرم ، ثنا يزيد بن هارون ، أنا أبو مالك الأشجعي ، عن ربعي بن حراش ، عن حذيفة ، عن النبي ﷺ قال : " كلُّ معروفٍ صدقةٌ ". أخرجه مسلم في الصحيح من وجهين آخرين عن أبي مالك الأشجعي.

**واتای فەرمودە:**

گشت کارو کردەوەیەکی باش و چاك له پاداشتدا وەکو خێرە.

**له سودەکانی فەرمودە:**

١- فراوانی و زۆری رێگاکانی خێر له ئیسلامدا.

٢- نابێت مرۆڤ هیچ شتێکی چاکە بەکەم دابنێ.

٣- هەمو جۆرێکی چاکە ناوی خێری دەچێتە سەر.

## الباب الخامس والثلاثون: في الإصلاح بين الناس، وترك ما يفسد بينهم من النميمة وغيرها

## بابەتی سی و پێنج: ئاشتەوایی کردن لە نێوان خەڵکداو، وازهێنان لەو کارانەی نێوانیان تێك دەدا لە دووزبانی و شتی تر

حدثنا السيد أبو الحسن محمد بن الحسين بن داود العلوي ، أنا أبو القاسم عبد الله بن إبراهيم بن بالويه ، ح وأخبرنا أبو طاهر الفقيه ، أنا أبو بكر محمد بن الحسين القطان قالا : ثنا أحمد بن يوسف السلمي ، ثنا عبد الرزاق ، ثنا معمر ، عن همام بن منبه قال : هذا ما حدثنا أبو هريرة قال : قال رسول الله ﷺ : " **كلُّ سُلامى من الناس عليه صدقةٌ، كل يومٍ تطلُع عليه الشمس ، تعدلُ بين اثنين صدقة ، وتُعين الرَّجلَ في دابَّته وتَحملُه عليها ، أو تَرفعُ له عليها متاعَهُ صدقة ، والكلمةُ الطيبةُ صدقة ، وكل خُطوةٍ يَخطوها إلى الصلاة صدقة ، ويُميطُ الأذى عن الطريق صدقة** ". رواه مسلم في الصحيح عن محمد بن رافع ، عن عبد الرزاق.

**واتای فەرمودە:**

هەمو جومگەو ئێسقانێکی مرۆڤ خێرێکی لەسەرە، هەر رۆژێك کە خۆری تێدا هەڵدێت ، نێوان دوو کەس - کە ناکۆکیان هەیە - ئاشت بکەیەوە خێرێکەو، یارمەتی مرۆڤ بدەی تا سواری وڵاغەکەی دەبێت، یان بارەکەی لەگەڵ باریکەی خێرێکەو، قسەی خۆش خێرێکەو، هەر هەنگاوێك دەیهاوێژی بۆ نوێژ خێرێکەو، لابردنی ئەو شتانەی زیان بەخەڵك دەگەیەنن لەسەر رێگەش خێرێکە.

**له سودەکانی فەرمودە:**

١- رێگاکانی خێر و چاکە له ئیسلامدا زۆرن و هەمو چینەکانی کۆمەڵگا دەتوانن چاکەو خێر ئەنجام بدەن، هەر یەك بەگوێرەی ئاستی خۆی.

٢- ئێسقان، كە ڕاگری لاشەی مرۆڤن و، جومگەكان كە مرۆڤ شتیان پێدەگرێت و بەردەواو جووڵەیان پێدەكات و كارەكانی پێ ئەنجام دەدا، لە نیعمەتەكانی خودان، بۆیە پێغەمبەر ﷺ هانی موسڵمانی دا كە لەبەرامبەر ئەم نیعمەتەدا، خێرو چاكە ئەنجام بدات.

٣- گەورەیی ئاشتكردنەوەی نێوان دوو كەس، یان دوو هۆز، یان دوو دەوڵەت، كە ناكۆكیان لەنێواندا هەیە.

٤- هاندانی موسڵمان بۆ هاریكاری كۆمەڵایەتی و، پتەوكردنی پەیوەندی نێوان تاكەكانی كۆمەڵگە، هێنانەوەی نمونەش بە وڵاغ، چونكە هۆی گواستنەوەی ئەو سەردەمە بوە، نهۆش ئۆتومۆبیل و هۆیەكانی تری گواستنەوە شوێنیان گرتوتەوە.

٥- ئاخاوتن و قسەی باش و خۆش لە ڕێگاكانی وەدەستهێنانی خێرە لە ئیسلامدا.

٦- گەورەیی چوونە مزگەوت بۆ بەجێگەیاندنی نوێژی بەكۆمەڵ.

٧- بایەخدانی ئیسلام بە ژینگە پارێزی و پارێزگاریكردنی لەسەر ژینگەیەكی تەندروستدار، بەفرەنەدانی پیسی و شتی زیانبەخش بۆ سەر ڕێگا گشتیەكان و، لابردنیان لەكاتی هەبونیان لەسەر ڕێگاكاندا.

٨- ئایینی پیرۆزی ئیسلام گشت لایەنەكانی ژیانی مرۆڤ دەگرێتەوە.

أخبرنا أبو الحسين محمد بن الحسين بن محمد بن الفضل القطان ، ببغداد ، أنا أبو عمرو بن السماك ، ثنا أحمد بن عبد الجبار ، ثنا أبو معاوية ، عن الأعمش ، عن عمرو بن مرة ، عن سالم هو ابن أبي الجعد ، عن أم الدرداء ، عن أبي الدرداء قال : قال رسول الله ﷺ : **" ألا أُخبِرُكُم بأفضلَ من درجةِ الصيامِ والصلاةِ والصدقة ؟ "**. قالوا : بلى يا رسول الله ، قال : **" إصلاحُ ذاتِ البينِ ، فإن فساد ذات البين هي الحالقةُ "**.

**واتای فەرمودە:**

پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ئایا پێتان بڵێم كە كامە كردەوە پلەو پاداشتەكەی زیاترە لە پلەو پاداشتی ڕۆژووی – سوننەت و– نوێژی – سوننەت و– خێركردن؟ وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خودا! فەرموی ﷺ : ئاشتكردنەوە و باشكردنی نێوان خەڵك، چونكە ناكۆكی و گەندەڵی نێوان خەڵك لابەری ئایینە– هەروەكو چۆن گوێزان پرچی سەر لادەبات–.

**لە سودەكانی فەرمودە:**

١- هاندان بۆ ئاشتكردنەوەی نێوان خەڵك ، چونكە ناكۆكی نێوان خەڵك زۆرجار كوشتن و ئەتك كردن و ماڵ زەوتكردنی لێ دەكەوێتەوە.

٢- بونی ناكۆكی لە نێوان دوو كەسدا، یان زیاتر دەبێتە هۆی تاشینی ئایین لە مرۆڤ.

أخبرنا أبو عبد الله الحافظ ، ثنا أبو العباس محمد بن يعقوب ، ثنا الحسن بن علي بن عفان ، ثنا عبد الله بن نمير ، عن الأعمش ، عن أبي صالح ، عن أبي هريرة قال : قال رسول الله ﷺ : "

**تجِدُ شرَّ الناس يوم القيامة ذا الوَجهين ، الذي يأتي هؤلاءِ بحديثِ هؤلاءِ ، وهؤلاء بحديث هـؤلاء ".**
أخرجه البخاري في الصحيح عن عمر بن حفص ، عن أبيه ، عن الأعمش.

**واتاى فەرمودە:**

لە دوا رۆژدا دەبینی خراپترین کەس ئەوەیە کـە دووڕووە: قسـەی ئەوانـە دەبێتـە لای ئـەوانی ترو، قسەی ئەوانی تریش دەهێنێتە لای ئەوانە.

**لە سودەکانى فەرمودە:**

١- قسەگێرانەوە ( نميمة) و دووزبانی گوناهێکی گەورەیە.

٢- پێویستە موسڵمان خۆی دووربگرێت لە ڕەوشتی قسەگێرانەوە.

٣- لە رۆژی دوایدا، قسەگێرەوە لە خراپترین کەسەکانە.

أخبرنا أبو عبد الله الحافظ ، ثنا أبو عبد الله محمد بن يعقوب ، ثنا محمد بن عبد الوهاب الفـراء ، أنا أبو نعيم ، ثنا سفيان ، عن منصور ، عن إبراهيم ، عن همام بن الحارث قال : كنـا جُلوساً عنـد حذيفة ، فمرَّ رجل فقالوا : هذا يرفع الحـديث إلى عثمـان ﷺ ، فقـال حذيفـة : سمعـت رسـول الله ﷺ يقول : **" لا يدخلُ الجنةَ قَتّاتٌ "**. رواه البخاري في الصحيح عن أبي نعيم وأخرجه مسلم من وجه آخر عن منصور بن المعتمر.

**واتاى فەرمودە:**

ناچێتە بەهەشتەوە – لە سەرەتادا– کەسی قسەگێرەوەو دووڕوو ( نمام ).

**لە سودەکانى فەرمودە:**

١- پێشـەوا ( النـووی ) دەڵێ: " زانایـان وتویانـە: قسـەگێرانەوە ( النميمـة) بریتیـە لـە گواستنەوەی قسەی هەندێ خەڵك بـۆ هەنـدێکی تریـان بـۆ دروسـتکردنی نـاکۆکی لـە نێوانیانـدا" . صحيح مسلم بشرح النووي، ٢/ ١١٢.

٢- بزانە ئەگەر قسەگێرانەوە ( نميمة) بەرژەوەندیەکی شـەرعی تێـدابو ، ئـەوا سوونەتە یـان واجبە بەگوێرەی بارودۆخەکان، بۆ نمونە: ئەگەر کەسێك زانی کە فلانە کەسە دەیەوێ ئازاری فلانە کەسە بدات بە زۆرداری، جا کەسەکەی ئاگادار کردەوە، ئەوا دروستەو نابێتە دووزبانی.

هەروا ئەگەر کەسێك سەرکردەی یان هەر کاربەدەستێکی ئاگادارکردەوە کە فلانە کەسـە ئـەو ئیشـە دەکـاو هـەوڵی خراپـەکاری دەداو، پێویسـتیش بـو سـەرکردە یـان کاربەدەسـت ئـەوەی دۆزیبایەوەو لایبردبایە، ئەوا دروستە.

٣- دورکەوتنەوە لە کەسی دووزبان و قسەگێرەوەو ڕق لێ بونەوەی.

٤- سووربونی ئیسلام لەسەر جێگیربونی پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان.

## الباب السادس والثلاثون: في التواصل والتحابب، وما ينهى عنه، من التقاطع والتحاسد والتدابر والاغتياب

## بابەتی سی و شەش: پێکگەیشتن ویەکترخۆشویستن و. ئەوەی قەدەغەکراوە لە لێك کردنەوەو ئیرەیی بەیەکتربردن و پشت لەیەکترکردن و غەیبەت کردن

أخبرنا أبو القاسم زيد بن أبي هاشم العلوي ، بالكوفة ، أنا أبو جعفر محمد بن علي بن دحيم ، ثنا إبراهيم بن عبد الله ، ثنا وكيع ، عن الأعمش ، عن أبي صالح ، عن أبي هريرة قال : قال رسول الله ﷺ : **" والذي نفسي بيده، لا تَدخلون الجنةَ حتى تُؤمِنوا ، ولا تؤمنوا حتى تَحابّوا ، أوَلا أدُلُّكم على شيءٍ إذا فعلتُموه تحابَبْتُم ؟ أفشُوا السَّلامَ بينكم "**. رواه مسلم في الصحيح عن أبي بكر بن أبي شيبة ، عن وكيع.

**واتای فەرموده:**

پێغەمبەرﷺ دەفەرمێ: سوێند بەو خودایەی گیانی منی بەدەستە، ئێوە ناچنە بەهەشتەوە تاوەکو بڕوا نەهێنن، بڕواشتان تەواو نابێ تاوەکو یەکترتان خۆش دەوێ، ئایا ڕێنوێنیتان بکەم بۆ شتێك ئەگەر ئەو شتەتان کرد یەکترتان خۆش بوێ؟ سەلام کردن لە نێوان خۆتاندا بلاوبکەنەوە.

**لە سودەکانی فەرموده:**

١- گەورەیی سەلام کردن و هاندانی موسڵمانان بۆ سەلامکردن، لەهەر کەسێك، بی ناسی ، یان نەیناسی.

٢- سەلامکردن هۆیەکی سەرەکی بلاوبونەوەی خۆشەویستی یە لە نێو تاکەکانی کۆمەڵگادا.

٣- سەلامکردن دروشمی ئیسلامە و ئیسلامیش ئایینی ئاشتیە.

٤- بەهێزکردنی پەیوەندیە کۆمەلآیەتیەکان لە ئیسلامدا بایەخێکی زۆری پێدراوە.

أخبرنا أبو زكريا بن أبي إسحاق ، ثنا أبو الحسن أحمد بن محمد بن عبدوس ، ثنا عثمان بن سعيد الدارمي ، ثنا القعنبي ، فيما قرأ على مالك ، عن عبد الله بن عبد الرحمن بن معمر ، عن أبي الحباب سعيد بن يسار ، عن أبي هريرة ، أن رسول الله ﷺ قال : **" إن اللهَ عزّ وجلّ يقول يوم القيامة : أينَ المُتَحابّون بِجلالي ؟ اليومَ أُظِلُّهم في ظِلّي ، يومَ لا ظِلَّ إلا ظِلّي "**. رواه مسلم في الصحيح عن قتيبة ، عن مالك.

**واتای فەرموده:**

خودای پایەبەرز لە دوارۆژدا دەفەرمێ: لە کوێن ئەوانەی یەکتریان خۆشویستوە - لە دنیادا - لە پێناو مەزنایەتی مندا؟ ئەمڕۆ لە ژێر سێبەری عەرشی خۆم دایاندەنێم، لە ڕۆژێکدا کە هیچ سێبەرێك نیە ، تەنها سێبەری عەرشی من نەبێ.

وقد روينا عن معاذ بن جبل ، وقيل عن عبادة بن الصامت ، عن النبي ﷺ قال : **" قال اللهُ عز وجل : وَجبتْ محبّتي للمُتحابّينَ فيَّ ، والمُتجالِسينَ فِيَّ ، والمُتَباذِلينَ فِيَّ ، والمُتَزاوِرين فِيَّ"**.

**واتای فەرمودە:**

خودای پایەبەرز دەفەرمێ: خۆشەویستی من سەلماوە بۆ ئەوانەی یەکتریان خۆش دەوێ لە پێناو منداو، بۆ ئەوانەی لەگەڵ یەکتری دادەنیشن لە پێناو منداو، بۆ ئەوانەی ماڵیان دەبەخشن لە پێناو رازیبونی منداو، بۆ ئەوانەی سەردانی یەکتری دەکەن لە پێناو مندا.

**لە سودەکانی هەردوو فەرمودە رابردووەکاندا:**

١- گەورەیی خۆشەویستنی یەکتری و دانیشتن لەگەڵ یەکتری و، بەخشینی ماڵ و سەردان کردنی یەکتری لە پێناو خودادا، نەك لە پێناو مەبەستێکی دنیایی.

٢- ئەوانەی یەکتریان خۆش دەوێ لە پێناو خودادا، لەژێر سێبەری عەرشی خودادا دەبن لە دوارۆژدا.

أخبرنا علي بن محمد بن عبد الله بن بشران ، أنا إسماعيل بن محمد الصفار ، ثنا أحمد بن منصور الرمادي ، ثنا عبد الرزاق بن همام ، أنا معمر ، عن الزهري ، عن أنس بن مالك قال : قال رسول الله ﷺ : **" لا تَحاسَدوا ، ولا تقاطَعوا ، ولا تدابَروا ، وكونوا عبادَ اللهِ إخوانا ، ولا يَحِلُّ لمسلم أن يهجُرَ أخاه فوقَ ثلاثٍ ".**

**واتای فەرمودە:**

پێغەمبەرﷺ دەفەرمێ : ئیرەیی بەیەکتر مەبن و، لە یەکتری دانەبڕێن و، پشت لەیەکتری مەکەن و، ببنە بەندەکانی خودا وەکو براو، حەلال نیە موسڵمانێك قسە لەگەڵ براکەی موسڵمانی نەکا زیاتر لە سێ - رۆژو شەو- .

**لە سودەکانی فەرمودە:**

١- ئیرەیی نەخۆشیەکی کوشندەی کۆمەڵایەتییە و ئیسلام حەرامی کردووە.

٢- پێویستە موسڵمان پشت لە موسڵمان نەکا.

٣- ئیسلام رێگەی داوە کە موسڵمان قسە لەگەڵ برای موسڵمانی نەکا بۆ ماوەی سێ رۆژ یان کەمتر لەبەر ئەمانەی خوارەوە:

- مرۆڤ رەوشتی تووڕەیی تێدا هەیە، بۆ ئەوەی لەو ماوەیەدا بگەڕێتەوەو پەشیمان ببێتەوە.
- ماوەکە کەمە.

أخبرنا أبو عبد الله الحافظ ، أنا أبو محمد المزني ، وأبو علي حامد بن محمد الهروي قالا : ثنا علي بن محمد بن عيسى ، ثنا أبو اليمان ، أنا شعيب ، عن الزهري ، أنه قال : أخبرني أنس بن مالك ، أن رسول الله ﷺ قال : **" لا تباغَضوا ، ولا تحاسَدوا ، ولا تدابَروا ، وكونوا عباد الله إخوانا ، لا يحِلُّ لمسلم أن يهجر أخاه فوق ثلاث ليالٍ ، يلتقيان، يصُدُّ هذا ويصُدُّ هذا ، وخيرُهما الذي يبدأ بالسلام ".** رواه البخاري عن أبي اليمان ورواه مسلم عن محمد بن رافع وعبد بن حميد ، عن عبد الرزاق.

**واتای فەرمودە:**

پێغەمبەرﷺ دەفەرمێ : تووڕە نەبن لە یەکتری و، ئیرەیی بەیەکتری نەبن و،پشت لەیەکتری مەکەن و، ببنە بەندەی خوداو برای یەکتری، حەلال نیە بۆ موسڵمان قسە لەگەڵ برای موسڵمانی نەکا زیاتر لە سێ شەو، کە دەگەنە یەکتری، ئەمە ڕووی وەردەگێری و، ئەوەی تریش ڕووی وەردەگێری و، باشترینیان ئەوەیە کە یەکەم جار سەلام لەوەی تریان دەکات.

أخبرنا محمد بن عبد الله الحافظ ، أنا أبو بكر أحمد بن إسحاق الفقيه ، أخبرنا موسى بن الحسن بن عباد ، أخبرنا أحمد بن يونس ، ثنا أبو بكر بن عياش ، عن الأعمش ، عن سعيد بن عبد الله بن جريج ، عن أبي برزة قال : قال رسول الله ﷺ : **" يا مَعشرَ من آمن بلسانه، ولم يَدخلِ الإيمانُ قلبَه ، لا تغتابُوا المسلمينَ ، ولا تتَّبِعوا عَوراتِهم ، فإنه من يَتْبَعْ عورةَ أخيه المؤمن، يَتْبَعُ اللهُ عورتَه ، ومن يتْبعِ اللهُ عورته، يَفضَحْهُ في بيته "**. أخرجه أبو داود السجستاني عن عثمان بن أبي شيبة ، عن أسود بن عامر ، عن أبي بكر بن عياش.

**واتای فەرمودە:**

پێغەمبەرﷺ دەفەرمێ : ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە بە زبانتان و، بڕواش نەچوتە ناو دڵتانەوە، غەیبەتی موسڵمانان مەکەن و، بەدوای عەیب و خراپەکانیاندا مەکەون، هەر کەسێك بەدوای عەیب و خراپەی برا ئیمانداره‌کەی بکەوێ، خوداش عەیب و خراپەکانی ئەو دیار دەکا، هەر کەسێکیش خودا عەیب و خراپەکانی ئاشکرا بکا، عەیب و خراپەکانی ئاشکرا دەکات، ئەگەر لە ماڵی خۆیدا بێ و لەبەر چاوان نەبێ.

**لە سودەکانی فەرمودە:**

١- غەیبەت کردنی موسڵمان لە دروشمی مرۆڤی دووڕووە نەك بڕوادار.

٢- گومانی خراپ بە موسڵمان نەبەی و شوێن خراپەکانی مەکەوە.

## الباب السابع والثلاثون: في حسن الخلق، وما يستحب من كظم الغيظ والتواضع

## بابەتی سی و حەوت: ڕەوشتی جوان و، سوننەتە مرۆڤ تووڕەییەکەی بخواتەوەو خۆی بەکەم بزانێ

روينا عن أبي هريرة وغيره ، عن النبي ﷺ أنه قال : **" أكملُ المؤمنين إيماناً، أحسنُهُم خُلُقاً "**. وفي رواية بعضهم : **" من أكمل المؤمنين "**.

**واتای فەرمودە:**

پێغەمبەرﷺ دەفەرمێ : تەواوترینی بڕواداران لە ڕووی بڕواوە، ئەو بڕوادارانەن کە ڕەوشتەکانیان جوانترو ڕێکترن.

أخبرنا أبو الحسين بن بشران ، أنا أبو جعفر الرزاز ، ثنا محمد بن عبيد الله بن المنادي ، ثنا وهب بن جرير ، ثنا شعبة ، عن الأعمش ، ح وأخبرنا أبو عبد الله الحافظ ، ثنا أبو العباس محمد بن يعقوب ، ثنا الحسن بن علي بن عفان ، ثنا عبد الله بن نمير ، عن الأعمش ، عن شقيق ، عن مسروق قال : سمعت عبد الله بن عمرو يقول : إن رسول الله ﷺ لم يكن فاحشا ولا مُتَفحِّشا ، وإنه كان يقول: **" إنّ خياركم أحاسِنُكم أخلاقا "**. لفظ حديث ابن نمير، رواه البخاري في الصحيح عن ابن عمر ، عن شعبة ورواه مسلم عن محمد بن عبد الله بن نمير ، عن أبيه.

**واتای فەرموده:**

عەبدوللای کوڕی عەمر دەیوت: پێغەمبەری خودا ﷺ خاوەن کردارو قسەی خراپ نەبوو، هەوڵیشی نەدادا وابێت و، پێغەمبەرﷺ دەیفەرمو: باشترینتان ئەوانەن کە ڕەوشتەکانیان جوان و رێکە.

**لە سوودەکانی فەرموده:**

١- گەورەیی ڕەوشتەکانی پێغەمبەر ﷺ.

٢- پێویستە موسڵمان خۆی برازێنێتەوە بە ڕەوشتی بەرز.

٣- دورکەوتنەوە لە ڕەوشتە بەدو خراپەکان.

أخبرنا أبو الحسين بن بشران ، أنا إسماعيل بن محمد الصفار ، وأبو جعفر الرزاز قالا : ثنا سعدان بن نصر ، ثنا سفيان ، عن عمرو بن دينار ، عن ابن أبي مليكة ، عن يعلى بن مملك ، عن أم الدرداء ، ترويه عن أبي الدرداء ، عن النبي ﷺ قال : **" من أُعطِيَ حظَّهُ من الرِّفقِ، فقد أُعطِي حظّه من الخير ، ومن حَرُم حظّه من الرِّفق، فقد حرُم حظه من الخير "**.

**واتای فەرموده:**

پێغەمبەرﷺ دەفەرمێ: هەر کەسێك بەشی خۆی لە نەرم و نیانی پێدرا، ئەوە بەشەکەی لە خێرو چاکە پێدراوە، هەر کەسێکیش بێبەشکرا لە بەشەکەی لە نەرم و نیانی ، ئەوا بێبەشکراوە لە بەشەکەی لە خێرو چاکە.

**لە سوودەکانی فەرموده:**

١- هاندان بۆ نەرم و نیانی و میانڕەوی و ناوەندێتی .

٢- دوورکەوتنەوە لە توندوتیژی بەگشت جۆرەکانی و ، ئیسلام دژی توندوتیژیەو ئاینی ئاشتیە.

٣- بەنەرم و نیانی شتە داواکراوەکان بەدەست دەهێن.

وقال : **" أثقلُ شيءٍ في ميزان المؤمن خُلقٌ حسن ، إنّ الله تعالى يُبغِضُ الفاحِشَ البَذيءَ "**.

**واتای فەرموده:**

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمێ: گرانترین شت لە تەرازووی بڕواداردا ڕەوشتێکی بەرزە، خودای پایەبەرز ڕقی لەو کەسەیە کە قسەو کرداری خراپن و شەرمیشی نیە.

أخبرنا أبو الفتح هلال بن محمد بن جعفر ، ببغداد أنا الحسين بن يحيى بن عياش القطان ، ثنا أبو الأشعث ، ثنا حماد بن زيد ، عن ثابت ، عن أنس بن مالك قال : " **لقد خدمتُ رسولَ الله ﷺ ، عشرَ سنين ، فوَالله ما قال لي : أُفٍّ قَطُّ ، ولا قال لي لشيء فعلتُه : لِمَ فعلتَ كذا ؟ ولا لشيء لم أفعلْهُ : ألا فعلتَ كذا** " رواه مسلم عن سعيد بن منصور ، وأبي الربيع ، عن حماد.

**واتای فەرمودە:**

ئەنەس ﷺ دەڵێ: بۆ ماوەی دە ساڵ، خزمەتی پێغەمبەرم کرد ﷺ، سوێند بەخودا تەنها پێی نەفەرموم: ئۆف، ئەگەر شتێکیشم کردبایە پێمی نەدەفەرمو: بۆچی ئەم کارەت کردووە؟ ئەگەر کارێکیشم نەکردبایە پێی نەدەفەرموم: بۆ چی ئەم کارەت نەکردووە.

**لە سودەکانی فەرمودە:**

١- ئەم فەرمودەیە تێروتەسەلی و کاملی ڕەوشتی پێغەمبەر ﷺو لێبووردەیی و خۆبەکەم زانینی ئەو دەردەخات.

٢- گەرەکە موسڵمان پەیڕەوی پێغەمبەرەکەی بکا لە ڕەوشتە بەرزەکانیدا.

حدثنا السيد أبو الحسن محمد بن الحسين العلوي ، أنا الحسن بن الحسين بن منصور السمسار ، ثنا حامد بن محمود المقري ، ثنا إسحاق بن سليمان الرازي قال : سمعت مالك بن أنس يذكر ، عن الزهري ، عن سعيد بن المسيب ، عن أبي هريرة ، أن رسول الله ﷺ قال : " **ليس الشديدُ بالصُّرعة ، إنما الشديدُ الذي يَملِكُ نفسَه عِند الغضب** ". رواه البخاري عن عبد الله بن يوسف ورواه مسلم عن يحيى بن يحيى ، وعبد الأعلى بن حماد ، كلهم عن مالك.

**واتای فەرمودە:**

پێغەمبەرﷺ دەفەرمێ: ئازا ئەو کەسە نیە کە زۆر زۆرانبازی دەکات، بەڵکو ئازا ئەو کەسەیە کە جڵەوی خۆی دەگرێ لەکاتی تووڕەبوندا.

**لە سودەکانی فەرمودە:**

١- دورکەوتنەوە لە ڕەوشتی تووڕەبوون، چونکە ڕەوشتێکی خراپەو دەرەنجامەکانیشی کارەساتن.

أخبرنا أبو الفتح هلال بن محمد بن جعفر البغدادي بها ، ثنا الحسين بن يحيى بن عياش القطان ، ثنا أبو الأشعث ، ثنا خالد بن الحارث ، ثنا سعيد ، عن قتادة ، ثنا غير واحد ممن لقي الوفد ، وذكر أبو نضرة أنه حدث عن أبي سعيد الخدري في قصة وفد عبد القيس قال : ثم قال النبي ﷺ

لأشجِّ عبد القيس : " **إن فيك خَصلتين يُحِبُّهما اللهُ تعالى ورسولُه : الحِلمَ والأناةَ** ". أخرجه مسلم من حديث سعيد بن أبي عروبة.

**واتای فەرموده:**

پێغەمبەر ﷺ بە ئەشەججی عەبدولقەیسی فەرمو: تۆ دوو ڕەوشتت تێدایە کە خودای پایەبەرزو پێغەمبەرەکەی خۆشیانی دەوێ: ئەقڵ – دیقەتدان و تێڕامان– و لەسەرەخۆیی .

**لە سودەکانی فەرموده:**

١– هاندان بۆ خۆڕازاندنەوە بە ڕەوشتی تێڕوانین و نەرم و نیانی و لەسەرەخۆیی.

أخبرنا أبو الحسن علي بن محمد بن علي المقري الإسفراييني بها ، ثنا الحسن بن محمد بن إسحاق ، ثنا يوسف بن يعقوب القاضي ، ثنا أبو الربيع ، ثنا إسماعيل بن جعفر ، ثنا العلاء بن عبد الرحمن ، عن أبيه ، عن أبي هريرة قال : قال رسول الله ﷺ : " **ما نَقصتْ صدقةٌ من مالٍ ، وما زاد اللهُ عبدا بالعفو إلا عِزّاً ، وما تواضَعَ أحدٌ لِلّهِ إلا رفعهُ اللهُ عز وجل** ". رواه مسلم عن قتيبة وغيره ، عن إسماعيل.

**واتای فەرموده:**

پێغەمبەرﷺ دەفەرمێ: هیچ خێرێك ماڵ کەم ناکاتەوە، هەر بەندەیەکیش لێبوردە بێ مەگەر خودا عیززەتی ئەو بەندەیە زۆر دەکاو، هەر یەکێکیش بۆ خودا خۆی بەکەم زانی مەگەر خودای پایەبەرز پاداشت و پلەوپایەی ئەو کەسە بەرز دەکاتەوە.

**لە سودەکانی فەرموده:**

١– خێر کردن و زەکات دان ماڵ کەم ناکاتەوە، بە پێچەوانەوە زیادی دەکات. ئەگەر دیقەتی ئەم فەرمودەیە بدەین لەدیدێکی ئابووریانەوە دەبینین ئەو ماڵەی مرۆڤ دەیبەخشێ بۆ ئەو دەگەڕێتەوە ، چونکە هەژار ئەو ماڵەی وەریگرتوە خەرجی دەکات لە کڕینی ئەو کاڵاو پێداویستیانەی کە کۆمەڵگا بەرهەمیان دەهێنێت، بەمەش خواست لەسەر کاڵاکان زۆردەبێ و دەبێتە هۆی بووژانەی بازاڕ . سەرەڕای ئەوەی کە خودا قەرەبووی ئەو کەسە دەکات کە ماڵی بەخشیوە لە دنیاداو لە دوارۆژیشدا پاداشتی دەداتەوە، بەمەش بەخشینی ماڵ دەبێتە ڕووناکیەکی بریسکەدار لە ئاسمانی ئابووری ئیسلامیدا.

٢– لێبووردن هۆی سەرکەوتن و گەورەییە.

٣– خۆبەکەم زانین ڕەوشتێکی نرخدارە.

## الباب الثامن والثلاثون: في مخالطة الناس وعشرتهم بالمعروف
## بابەتی سی و هەشت: تێکەڵاوبون لەگەڵ خەڵك و ژیان لەگەڵیان بەچاکە

أخبرنا أبو عبد الله الحافظ ، ثنا أبو الحسين عبد الباقي بن قانع الحافظ ، ثنا إبراهيم بن الهيثم بن أبي إياس ، ثنا شعبة ، عن الأعمش ، عن يحيى بن وثاب ، عن ابن عمر قال : قال رسول الله ﷺ : **" المؤمنُ الذي يُعاشِرُ الناسَ ، ويَصبِرُ على أذاهُم، أفضلُ من المؤمن الذي لا يُعاشِرُ الناس، ولا يَصبِرُ على أذاهُم ".**

**واتای فەرمودە:**

پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ئەو بڕوادارەی تێکەڵ بە خەڵك دەبێ و لەگەڵیان دەژی و، ئارام دەگرێ لەسەر ئەو ئێش و ئازارەی توشی دەبن لەلایەن خەڵکەوە، باشترە لەو بڕوادارەی کە تێکەڵ بە خەڵك نابێ و، ئارامیش ناگرێ لەسەر ئەو ئێش و ئازارەی توشی دەبن لەلایەن خەڵکەوە.

**لە سودەکانی فەرمودە:**

١- هاندان بۆ ژیان لەگەڵ خۆشی و ناخۆشیەکانی موسڵمانان.

أخبرنا أبو علي الحسين بن محمد الروذباري ، وأبو عبد الله الحسين بن عمر بن برهان الغزال ، وأبو الحسين بن الفضل القطان ، وأبو محمد عبد الله بن يحيى بن عبد الجبار السكري ، ببغداد ، قالوا : ثنا إسماعيل بن محمد الصفار ، ثنا الحسن بن عرفة ، ثنا عبد الله بن المبارك ، عن الحسن بن عمرو الفقيمي ، عن منذر الثوري ، عن محمد ابن الحنفية قال : " ليس بحكيمٍ من لم يُعاشِرْ بالمعروف ، من لم يجِدْ من مُعاشرِ بُدّاً ، حتى يجعل اللهُ له فرجا – أو قال – مخرجا ". هذا هو المحفوظ عن محمد ابن الحنفية من قوله . وقد روي بإسناد ضعيف عن أبي فاطمة الأنماري ، عن النبي ﷺ .

## الباب التاسع والثلاثون: في كراهية البخل والشح، وما في بذل المال والسماحة فيه وحسن المعاملة مع الناس، من الخير والثواب
## بابەتی سی و نۆ: ناپەسندی ڕەزیلی و بەرچاوتەنگی و. بەخشینی ماڵ و لێبووردەیی لە بەخشینیدا و جوان مامڵەت کردن لەگەڵ خەڵکدا خێرو پاداشتی زۆرە

أخبرنا أبو عبد الله محمد بن عبد الله الحافظ ، ثنا أبو بكر بن إسحاق إملاء ، ثنا أبو المثنى ، ومحمد بن عيسى بن السكن قالا : ثنا القعنبي ، ثنا داود بن قيس ، عن عبيد الله بن مقسم ، عن جابر بن عبد الله ، أن رسول الله ﷺ قال : **" اتَّقُوا الظُلم ، فإن الظُلمَ ظُلُماتٌ يوم القيامة ، واتقوا الشُّحَ ، فإن الشحَ أهلك من كان قبلكم ، حَمَلَهُم على أن سَفكَوا دِماءَهُم، واستحلُّوا مَحارِمَهُم "**. رواه مسلم في الصحيح عن القعنبي.

**واتای فەرمودە:**

پێغەمبەر ﷺ فەرموی: خۆتان بپارێزن لە ستەم، چونکە ستەم تاریکی گەلێکە لە دوارۆژداو، خۆتان بپارێزن لە ڕەزیلی، چونکە ڕەزیلی گەلانی پێش ئێوەی لەناوبرد، وایلێکردن کە خوێنی خۆیان ڕشت و ، ناموس و ماڵی یەکتریان بەحەلال دانا.

**لە سودەکانی فەرمودە:**

١- ستەم و ڕەزیلی دوو ڕەوشتی خراپن لە دیدی ئیسلامداو ، پێویستە موسڵمان لێیان دووربکەوێتەوە.

٢- ستەم و ڕەزیلی فاکتەری سەرشۆری خاوەنەکانیانن لە دنیاو دوارۆژدا.

وحدثنا الإمام أبو الطيب سهل بن محمد بن سليمان ، ثنا أبو العباس محمد بن يعقوب ، ثنا محمد بن عبد الله بن عبد الحكم ، ثنا أبي ، وشعيب بن الليث قالا : أنا الليث بن سعد ، عن ابن الهاد ، عن سهيل بن أبي صالح ، عن صفوان بن أبي يزيد ، عن القعقاع بن اللجلاج ، عن أبي هريرة ، أنه سمع رسول الله ﷺ يقول : **" لا يَجتمِعُ غُبارٌ في سبيل الله ودخانُ جهنَّم، في جوفِ عبدٍ أبداً ، ولا يجتمعُ الشحُ والإيمانُ في قلبِ عبدٍ أبدا ".**

**واتای فەرمودە:**

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمێ: هەر گیز تۆزێك لە ڕێگەی خوداداو دووکەڵی دۆزەخ لە سینگی بەندەیەکدا کۆنابنەوەو، هەر گیزیش ڕەزیلی و بڕوای - تەواو - لە دڵی بەندەیەکدا کۆنابنەوە.

وروى صدقة بن موسى ، عن مالك بن دينار ، عن عبد الله بن غالب ، عن أبي سعيد الخدري قال : قال رسول الله ﷺ : **" خَصلتانِ لا يَجتمِعانِ في المؤمنِ : البُخلُ ، وسوءُ الخُلق ".** أخبرناه أبو محمد عبد الله بن يوسف ، أنا أبو سعيد بن الأعرابي ، ثنا أبو داود ، وإبراهيم بن فهد قالا : ثنا مسلم بن إبراهيم ، ثنا صدقة ، فذكره . وروي أيضا عن جعفر بن سليمان ، عن مالك بن دينار.

**واتای فەرمودە:**

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمێ: دوو ڕەوشت کۆنابنەوە لە بڕواداردا - کە پێیان ڕازی بێت ولێی جیانەبنەوە -: ڕەزیلی و، ڕەوشتی خراپ.

**لە سودەکانی هەردوو فەرمودەدا:**

١- دورکەوتنەوە لە ڕەزیلی و ڕەوشتی خراپ و، بڕوادار کەسێکی ڕەزیل و ڕەوشت خراپ نیە.

أخبرنا أبو عمرو محمد بن عبد الله الأديب ، ثنا أبو بكر الإسماعيلي ، أخبرني الحسن بن سفيان ، ثنا عباس بن الوليد الدمشقي ، ثنا علي بن عياش ، ثنا أبو غسان ، ثنا محمد بن المنكدر ، عن جابر بن عبد الله قال : قال رسول الله ﷺ : **" رحِم اللهُ عبداً سَمْحاً إذا باع ، سمحا إذا اشْترى ، سمحا إذا اقْتَضى ".**

**واتای فەرموده:**

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمێ: ڕەحمەتی خودا لە بەندەیەك بێ، لێبوردەبێ كاتێ دەفرۆشێ و، لێبووردە بێ كاتێ دەكڕێ و، لێبوردە بێ كاتێ قەرزی وەردەگرێتەوە.

وحدثنا السيد أبو الحسن العلوي ، أنا محمد بن عمر بن جميل الأزدي ، ثنا يحيى بن جعفر بن الزبرقان ، ثنا عبد الوهاب بن عطاء ، ثنا إسرائيل بن يونس ، عن زيد بن عطاء بن السائب ، عن محمد بن المنكدر ، فذكره ، غير أنه قال : " **غفر الله لرجل كان قبلكم ، كان سَهْلا إذا باع ، سهلا إذا اشترى ، سهلا إذا اقتضى** ". رواه البخاري عن علي بن عياش.

**واتای فەرموده:**

پێغەمبەر ﷺدەفەرمێ: خودا لە پیاوێك خۆش بوو لە پێش ئێوەدا، ئەو پیاوە ڕەفتاری ئاسان بو كاتێ شتی دەفرۆشت، یان دەیكری، یان قەرزی وەربگرتایەوە.

**لە سودەكانی هەردوو فەرمودەدا:**

١- هاندان بۆ لێبووردەیی لە كڕین و فرۆشتنداو، لە وەرگرتنەوەی قەرزدا.

٢- دورکەوتنەوە لە توندی و ڕەفتاری ناشیرین لە كاتی كڕین و فرۆشتندا.

٣- بازرگانی موسڵمان لێبووردەیەو، ڕەوشت بەرزەو، ڕەفتار جوانە.

وروينا عن عبد الله بن عمرو الأودي ، عن ابن مسعود ، عن النبي ﷺ قال : "**يحرُمُ على النّارِ كُلُّ هَيِّنٍ، لَيِّنٍ، قَرِيبٍ، سَهْلٍ** ". أخبرنا أبو بكر محمد بن أحمد بن عبد الله بن محمد بن منصور النوقاني بها ، أنا أبو حاتم محمد بن حبان البستي ، ثنا أحمد بن الحسن بن عبد الجبار الصوفي ، ثنا يحيى بن معين ، ثنا عبدة بن سليمان ، عن هشام بن عروة ، عن موسى بن عقبة ، عن عبد الله ، فذكره.

**واتای فەرموده:**

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمێ: قەدەغە دەكرێ لە دۆزەخ هەمو كەسێكی ئاسان و نەرم و نیان و نزيك لە خەڵكی بەدانیشتن لەگەڵیان لە دانیشگەكانی پەرستشداو، ڕەفتارو هەڵسوكەوتی ئاسان بێ دەگەڵ خەڵكدا لەگشت بوارەكانی ژیاندا.

**لە سودەكانی فەرمودەدا:**

١- نەرم و نیانی و ڕەوشتی بەرز هۆكارێكن بۆ دوركەوتنەوە لە ئاگری دۆزەخ.

أخبرنا أبو عبد الله الحافظ ، وأبو نصر محمد بن علي بن محمد الفقيه الشيرازي قالا : ثنا أبو عبد الله محمد بن يعقوب ، ثنا يحيى بن محمد بن يحيى ، ثنا أحمد بن يونس ، ثنا زهير ، ثنا منصور بن المعتمر ، عن ربعي بن حراش ، أن حذيفة ، حدثهم قال : قال رسول الله ﷺ : " **تَلَقَّتِ الملائكةُ روحَ رجلٍ مِمَّن كان قبلكم ، فقالوا : عمِلتَ من الخير شيئا ؟ قال : لا ، قالوا: تَذكَّرْ، قال :**

كنتُ أُداينُ الناسَ فآمُرُ فِتْياني أن يُنظِروا المُعسِر ، ويَتجوَّزوا عن المُوسِر " قال: " فقال اللهُ عز وجل : تَجَوَّزوا عنه ". رواه البخاري ، ومسلم في الصحيحين عن أحمد بن يونس.

**واتاى فەرمودە:**

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمێ: فریشتەکان پێشوازی ڕۆحی پیاوێکیان لە گەلانی پێش ئێوەدا کرد لەکاتی مردنیدا، فریشتەکان پێیان وت: ئایا دەزانی شتێکت کردبێ لە چاکە؟ وتی: نازانم، وتیان: بیربکەوە، وتی: من قەرزم بە خەڵك دەداو، بە خزمەتکارەکانم دەوت: مۆڵەتی تەنگدەست بدەن و، لە دەوڵەمەندیش ببورن، خودای پایەبەرزیش فەرموی: لەو بەندەم ببورن.

وأخبرناه أبو عبد الله محمد بن الفضل بن نظيف ، بمكة ثنا القاضي أبو طاهر محمد بن أحمد بن عبد الله المالكي إملاء ، ثنا إبراهيم بن شريك بن الفضل بن إسحاق الكوفي ، ثنا أحمد بن عبد الله بن يونس ، ثنا زائدة ، عن عبد الملك بن عمير ، عن ربعي بن حراش ، عن أبي اليسر قال : قال رسول الله ﷺ : " **من أنظر مُعْسِراً ، أو وَضَع عنه ، أظلَّهُ اللهُ في ظلِّه، يوم لا ظلَّ إلا ظلُّهُ** ". قال : وبصق أبو اليسَرَ في صحيفته، وقال لغريمه : اذهَبْ، فهي لك ، وذكر أنه كان معسرا . ورواه عبادة بن الوليد عن أبي اليسر ، ومن ذلك الوجه أخرجه مسلم في الصحيح.

**واتاى فەرمودە:**

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمێ: هەر کەسێك مۆڵەتی قەرزارێکی هەژاری خۆی بدا، یان کەم یا زۆر لە قەرزەکەی لەسەر لابدا، خودا دەیخاتە ژێر سێبەری عەرشی خۆی، لە ڕۆژێکدا هیچ سێبەرێك نیە تەنها سێبەری عەرشی ئەو نەبێ.

**لە سودەکانی هەردوو فەرمودەدا:**

١- گەورەیی مۆڵەتدانی قەرزدار ، ئەگەر کاتی قەرزدانەوەی هات و ، لەتوانایدا نەبو قەرزەکە بداتەوە، تاوەکو دەتوانێ قەرزەکە بداتەوە.

٢- هاندان بۆ قەرزدان بە خەڵك.

٣- کاری چاکە هۆکارێکە بۆ لێخۆشبونی خودا.

## الباب الأربعون

## في المؤمن يجتهد في استعمال ما ذكرناه في هذا الكتاب، ثم فيما ذكرناه في الأربعين التي خرجناها في شعار أهل الحديث ، ويستعين بالله في جميع ذلك ، فإذا حان حينه الذي لم ينج منه نبي مرسل ، ولا ينجو منه ملك مقرب ، أحسن الظن بالله عز وجل ، ورجا رحمته ، وجعل عليها اعتماده كما أمر به المصطفى عليه الصلاة والسلام.

**برِوادار کۆشش دەکا بۆ بەکارهێنانی ئەوەی باسمان کرد لەم پەرتوکەدا، ئنجا ئەوەی باسمانکردووە لەو چل باسانەی کە دەربارەی دروشمی خاوەن فەرمودە گواستومانەوە، لە هەموو**

**ئەمەدا داوای یارمەتی لە خودا دەکا، ئەگەر کاتی مردنیشی هات کە هیچ پێغەمبەرێکی نێردراو لێی رزگار نەبووە، هیچ فریشتەیەکی نێزیك لە خوداش لێی رزگار نابێت، ئومێدی باشی هەبێت بەخودای پایەبەرزو، داوای ڕەحمەتەکەی دەکاو، پشتی پێ دەبەستێت هەروەکو پێغەمبەر – درودی خودای لەسەر بێت – فەرمانی پێکردووە.**

وذلك فيما أخبرنا أبو محمد جناح بن نذير بن جناح القاضي ، بالكوفة ثنا أبو جعفر بن دحيم ، ثنا أحمد بن حازم بن أبي غرزة ، ثنا يعلى بن عبيد ، ثنا الأعمش ، عن أبي سفيان ، عن جابر قال : سمعت رسول الله ﷺ يقول قبل موته بثلاث : **" لا يَمُوتَنَّ أحدُكم، إلا وهو حَسَنُ الظَّنِّ بالله عز وجل ".** أخرجه مسلم عن أبي كريب ، عن أبي معاوية ، عن الأعمش.

**واتای فەرمودە:**

با یەکێکتان نەمرێ –لە بارێك لە بارەکاندا–، تەنها لەو بارەدا نەبێ کە ئومێدی باشی بەخودای پایەبەرز هەیە.

**لە سودەکانی فەرمودە:**

١– ئاگادارکردنەوەی موسڵمان کە بێ ئومێد نەبێ.

٢– هاندانی موسڵمان کە ئومێد و هیوای باشی هەبێ بە خودا.

٣– هانی موسڵمان دەدا کردەوەی باش ئەنجام بدا، کە سەردەکێشن بۆ ئومێد باشی بەخودا.

٤– پێشەوا ( النووي) دەڵێ:" من گەڕام بەدوای فەرمودە راستەکانی دەربارەی ترس و ئومێد، دیتم کە فەرمودەکانی ئومێدی چەندجارەی فەرمودەکانی ترسن". مرقاة المفاتيح، ٤/ ٦٤.

أخبرنا أبو الحسين بن بشران ، أنا الحسين بن صفوان ، ثنا عبد الله بن محمد بن أبي الدنيا ، ثنا أبو خيثمة ، ثنا شبابة بن سوار ، عن هشام بن الغاز البغدادي ، حدثني حيان أبو النضر قال : قال لي واثلة بن الأسقع : قدْني إلى يزيد بن الأسود ، فإنه قد بلغني أنّ لَمًّا به ، قال : فَقُدتُه ، فدخل عليه وهو ثقيلٌ، قد وُجِّه – يعني نحو القبلة – وقد ذهب عقله ، قال : نادُوه ، فقلت : إن هذا واثلةَ أخوك ، فأبقى الله من عقله أن سمع أن واثلة قد جاء ، فمدّ يده، فجعل يلتمس بها ، فعرفت ما يريد ، فأخذت كف واثلة فجعلتها في كفه ، وإنما أراد أن يضع يده في يد واثلة " وذلك لموضع يد واثلة من رسول الله ﷺ ، فجعل يضعها مرة على صدره ، ومرة على وجهه ، ومرة على فيه ، فقال واثلة : ألا تُخبِرُني عن شيء أسألك عنه ، كيف ظنُّك بالله ؟ قال : أغرَقَتْني ذنوبٌ لي ، أشفيتُ على هُلْكةٍ ، ولكن أرجو رحمةَ الله، فكبَّر واثلةُ، وكبَّر أهلُ البيت بتكبيره ، وقال : الله أكبر ، سمعت رسول الله ﷺ يقول : **" يقول اللهُ تعالى : أنا عِند ظَنِّ عبدي بي، فليَظُنَّ بي ما شاء".**

**واتای فەرمودە:**

( واثلة ) بە ( أبو النضر) ی وت: بمبە لای یەزیدی کوڕی ئەسوەد، چونکە زانیومە کە ئەو نەخۆش کەوتوە – نەخۆشیەکی نیمچە شێتی –، ( أبو النضر) وتی: منیش دەستم گرت و بردم،

ئەویش چووە لای ( یەزید) لە بارێکدا کە ( یزید ) نەخۆش بوو، ئاراستەی – بەرەو ڕووگە – کرابوو و هۆشی نەمابو، جا بانگیان کرد، کە ئەمە ( واثلة ) ی براتە، خودا ئەوەندە هۆشی بۆ هێشتەوە کە بیستی ( واثلة ) هاتوە، جا ( یزید) دەستی خۆی درێژ کردەوەو داوای پێدەکرد، منیش زانیم چی دەوێ، منیش لەپە دەستی ( واثلة)م گرت و خستمە ناو لەپە دەستی ( یزید)ەوە، ( یزید) ویستی دەستی دابنێتە ناو دەستی ( واثلة ) ، چونکە ( واثلة) شوێن دەستی لە پێغەمبەردا هەبو، ( یزید) جارێکیان دەستی ( واثلة) ی لەسەر سنگی دادەناو، کەرەتێکیان لەسەر ڕووخساری و ، جارێکی تریش لەسەر دەمی، ( واثلة ) وتی: شتێکت لێ دەپرسم پێم نالێی، ئایا گومانت چیە بەرامبەر بەخودا؟ وتی: گوناهەکانم منیان نقوم کردووە، خەریکە لەناودەچم، وەلێ ئومێدی ڕەحمەتی خوداشم هەیە، ( واثلة ) وتی: الله أكبر، خزم و کەسەکانیش لەگەڵ ( الله أكبر)ی ( واثلة)، ( الله أكبر) یان کردو، ( واثلة) وتی: الله أكبر، گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوە دەیفەرمو: خودای پایەبەرز دەفەرمێ:بەندەم چ هەستێکی بەرامبەر بەمن هەیە ، من وادەبم لەگەڵیدا– واتە بەندە یەقینی هەبێ کە خودا ڕەحمی پێدەکاو لێی خۆش دەبێ–، جا چی حەزدەکا با چاوەڕێی بکا لەمن.

**لە سودەکانی فەرمودە:**

١– گەورەیی ئومێد هەبون بەڕحمەتی خودا، بەتایبەتی لە سەرەمەرگدا.

أخبرنا أبو عبد الله الحافظ ، وأبو سعيد بن أبي عمرو قالا : ثنا أبو العباس محمد بن يعقوب ، ثنا أحمد بن عبد الجبار ، ثنا أبو معاوية ، عن الأعمش ، عن أبي صالح ، عن أبي هريرة قال : قال رسول الله ﷺ : **" قاربوا ، وسَدِّدوا ، وأبشروا ، واعلموا أنَّهُ لن ينجوَ أحدٌ بعمله " ، قالوا : ولا إياك يا رسول الله ؟ قال : "ولا إيّايَ ، إلا أنْ يَتغمَّدَنيَ اللهُ برحمةٍ منه وفضْلٍ "**. رواه مسلم في الصحيح عن أبي بكر عبد الله بن محمد بن أبي شيبة ، وأبي كريب ، عن أبي معاوية ، في الدعوات.

**واتای فەرمودە:**

مام ناوەند بن – نە زیادەڕۆیی بکەن نە کەمتەرخەم بن–، با کردەوەکانت ڕاست و دروست بن، مژدە بەخش بن و، بزانن هیچ یەکێك بە کردەوەی خۆی ڕزگاری نابێ ، وتیان: تۆش ئەی پێغەمبەری خوداﷺ؟ فەرمویﷺ: منیش، مەگەر خودا بە میهرەبانی و گەورەیی خۆی ڕزگارم بکا.

**لە سودەکانی فەرمودە:**

١– مرۆڤ بەڕەحمەتی خودا ڕزگاری دەبێت لە دوارۆژدا.

٢– کردەوەی باش هۆی وەدەستهێنانی ڕەحمەتی خودایە.

** ** **

## ژێدەرەکان


- فتح الباري شرح صحيح البخاري: أحمد بن علي بن حجر العسقلاني الشافعي، دار المعرفة – بيروت، تحقيق: محب الدين الخطيب.
- صحيح مسلم بشرح النووي: أبو زكريا يحيى بن شرف بن مري النووي، دار إحياء التراث العربي – بيروت ، ١٣٩٢، الطبعة الثانية.
- عمدة القاري شرح صحيح البخاري: بدر الدين محمود بن أحمد العيني، دار إحياء التراث العربي – بيروت.
- مرقاة المفاتيح شرح مشكاة المصابيح: علي بن سلطان محمد القاري، دار الكتب العلمية – لبنان/ بيروت – ١٤٢٢هـ – ٢٠٠١م، الطبعة: الأولى، تحقيق: جمال عيتاني.
- شرح السنة: الحسين بن مسعود البغوي، المكتب الإسلامي – دمشق ، بيروت – ١٤٠٣هـ – ١٩٨٣م، الطبعة الثانية، تحقيق: شعيب الأرناؤوط – محمد زهير الشاويش.
- التيسير بشرح الجامع الصغير: الإمام الحافظ زين الدين عبد الرؤوف المناوي، مكتبة الإمام الشافعي – الرياض – ١٤٠٨هـ – ١٩٨٨م، الطبعة الثالثة.
- عون المعبود شرح سنن أبي داود: محمد شمس الحق العظيم آبادي، دار الكتب العلمية – بيروت – ١٩٩٥م، الطبعة: الثانية.
- تحفة الأحوذي بشرح جامع الترمذي: محمد عبد الرحمن بن عبد الرحيم المباركفوري أبو العلا، دار الكتب العلمية – بيروت.


** ** **

لە ڕۆژی ( ٢٧) مانگی پیرۆزی ڕەمەزانی ساڵی ١٤٣٠ کۆچی ڕونکردنەوەی پەرتووکی
( الأربعون الصغرى للإمام البيهقي) تەواو بو بە پشتیوانی خودای پایەبەرز
لە شارۆچکەی بەحرکە – هەولێر، داواکرم لە خودای مەزن یارمەتیمان
بدات بۆ زیاتر خزمەتکردنی ئیسلام و موسڵمانان و قسەو
کردەوەکانمان بەدڵسۆزی بۆ ئەو بن و لێمان قبوڵ
بکاو لە تەرازووی چاکەکانمان دابنێ و لە من
و دایك و باوکم و گشت موسڵمانان
خۆش ببێ.